شیعر

# ئازارێك لەگەڵمدا پیاسە دەكات

فەرید مەخموری

هەولێر 2007 چاپی یەكەم

ناوی کتێب: ئازارێك لەگەڵمدا پیاسە دەکات
بابەت: شیعر
تایپ و هەڵەچن: فەرید مەخموری
نەخشەسازی ناوەوە: کەریم غەفور
تیراژ: 1000 دانە
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

لە کۆمەڵگای چاپەمەنی شەهاب لە هەولێر، چاپ کراوە



www.makhmuri.com
email: makhmuri@hotmail.com

# ڕوونکردنەوە

دوای کۆتایی هاتن بەو بارودۆخە نا سەقامگیرەی کە بەهۆی پرۆژەی سەفەرکردنمەوە لە ژیانمدا هەبوو و لەپاش گەیشتن و گیرسانەوەم لە وڵاتی سێیەم، یەکسەر بیرم لە کۆکردنەوەی شیعرە کۆن و نوێ و پەرتەوازەبووەکانم کردەوە، بۆ ئەوەی هەم لە فەوتان ڕزگاریان بێت و، هەم لە دەرفەتێکی گونجاودا بتوانم دووبارە چاپ وبڵاویان بکەمەوە، هەرچەندە لە ڕابردوودا دوو نامیلکەی تریشم بڵاوبۆتەوە، نزیکەی پانزە ساڵیشە لێرەو لەوێ بەرهەمەکانم لە گۆڤار و رۆژنامەکانی دەرەوە و ناوەوەی وڵات دێنە وەشان. بەڵام لەبەر ئەوەی هەر هەموویان پڕن لە هەڵەی چاپ و، بێ سەرو بەریی زۆریان پێوە دیارە، بۆیە دوای پاکنووس و هەڵەچنیی وورد، بە شێکیان لە دووتوێی ئەم کتێبەدا دووبارە رووناهی دەبیننەوە و، ئەوانەی تریش دوای دارشتنەوەو دەستکاری کردنەوەیان لەبەر کرچ و کاڵی و لاوازیی ناوەڕۆکەکانیان ڕووی بڵاوکردنەوەیان نەبوو،

هەروەها ئەم پەرتوکە دەبێتە تاکە سەرچاوەی باوەڕپێکراو بۆ پشت پێ بەستن و لێکۆڵینەوە لەسەر کردن. هاوکات لەڕووی دانان و دیزاینی شیعرەکانەوە ڕەچاوی بەرواری نوسین و ڕیزبەندی مێژویی کراوە مەبەستیش ئەوەبووە کە خوێنەر بتوانێ بە ئاسانی، بە پێی قۆناغ و کات و شوێنی نوسینیان، جیاوازیان لە نێواندا بکات و، خۆی بریاری ئەوە بدات کە ئایا لەڕووی زمان و وێنەو ستاتیکاوە چ گۆرانکاریەك بەسەر دەقەکاندا هاتووە.

بەو هیوایەی ئەم تاقیکرنەوەیە، کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردی پڕبکاتەوە و لەم بارەیەوە هەوڵ و ماندووبوونەکانمان ببنە جێی ڕەزامەندی ئێوە....

فەرید مەخموری

سیدنی

20.2.2007

# سووتان

بۆت نوسیبووم، لێت دەترسم
نەوەک رۆژێک لە یادم کەی
نەخێر گوڵم
غەمی عەشقت چیرۆکێکی ئاسان نیە
ئا بەم شێوەیە تێی بگەی!
ئێستا ساباتی ئەڤینت
بۆتە پەناگەی شەوانم
من بەبێ تۆ
بەهارێکی بێ سەوزایی و
پایزێکی پڕ خەزانم
ئەدی بۆچی
بە ئاگا نایەی لەو خەوەی
کە بەسەرتدا باریوە؟
ڕزگار نابی لەو پرسیارەی
کە تەنگی پێت هەڵچنیوە!
ئێتربەسە
هێندە دڵڕەقی مەنوێنە
لەوە زیاتر
بە تێزابی ئارام گرتن
کێڵگەی شیعرم مەسوتێنە!...

کوردستان-هەولێر
10.9.1995

# ئاواتێکی وێڵ

ئێستاکە من
هاوڕێی ڕێگایەکی دوور و
تاریک و چەوت و چەوێڵم
لە دوورەوە
هێمای غەمباری و پەشێوی
دیارە بە هەنیەو تەوێڵم
بەڵام چیبکەم؟
خۆشەویستیت ڕێگا نادا
ئەم هەرێمە پڕ ئازارە جێ بهێڵم..

کوردستان-هەولێر
1.10.1995

# چەپکێك یاد

بۆ دەهاتی؟
خۆت دەخستە گرتوخانەی ئەم شیعرانەم!
نەتدەزانی
شیعرەکانم سێدارەن و
دەبێ خۆتیان پێ هەڵواسی؟
پێم نەگوتی گەر هاتیە لام
مەگەڕێوە و
جێم مەهێڵە بە کەساسی؟
کە دەتزانی
بەرگەی پەتای عەشق ناگری
بۆ دەهاتی ژیانت لێ تاڵ دەکردم
لە ئەنجامدا، شنەی سۆزت
بۆ ئاقاری
سەدان مەرگەسات دەبردم!..

کوردستان-هەولێر
11.10.1995

## لەخەڵوەتگای یادی تۆدا

چەند شۆخێکم
بۆ پاڵەوانی ئەبەدیی
شیعرەکانم پاڵاوتوە
لێ، ئێستاشی لەگەڵدابێ
ناوی پیرۆزی هیچیانم
لە شیعرێکدا نەبردووە
بەڵام چیبکەم، ئەی شۆڕە ژن؟
لە خەڵوەتگای ناوی تۆدا
دەبم بە تۆ، دەبی بەمن!..

کوردستان-هەولێر
28.10.1995

# تیری ناحەز

کاتێ تریفەی مانگەشەو
ڕۆشن دەکا ژووری تارم
دڵنیایە
خەریکم شیعرێ دەنووسم
گوزارشت بێ، لە ئەڤینی من و یارم
کاتێکیش، کە
تریفەی مانگ هەڵدەوەرێ و
یەکەم تیشکی ئاسۆی دەم کەل دەردەکەوێ
ئەم ئەڤینە
سەدان تیرو وشەی ساردی
ناحەزانی بەردەکەوێ..

کوردستان-هەولێر
8.12.1995

# تۆران

کە یار تۆرا
لانەی ئومێدم خاپوور بوو
میحرابی شیعرم تێک شکا و
تەکیەی خۆشحاڵیم بێ نوور بوو
کە یار تۆرا
بوومە کانگای
پرسە و تاریکی و ڕەشبینی
لەو رۆژەوە
دەستە وەستانم لە کونجی
گرتووخانەی ماتەمینی!..

کوردستان- هەولێر
8.12.1995

# قەڵای ئازار

تۆ شیعرێکی
لە ناخمدا هەڵقوڵاوی
هەر دەتلێم و نابڕێیەوە
ئەفسونێکی لە دڵمدای
بە هیچ هێزێک، بەهیچ کەسێک، ناکرێیەوە
هەر فرمێسکێک
لە چاوانم بێتە خوارێ
بێگومان بە، لە تاو دووری باڵای تۆیە
چونکە ئازیز، بێ ئامێزت
هەنگاوەکانم نامۆیە
لەو ڕۆژەوەی
کە لێم تۆرای و ڕۆیشتی
وشەکانم هەمووی ئاخە
دڵی وێڵم
وڵاتێکی بێ بەیداخە
ئەو کاتانەی کە دڵدار بووین
شیعرەکانم قەڵایەکی پۆڵایین بوون
بەرگەی ئازاریان دەگرتی
لە بیرتە
لە باوەشی من نەبوایە، نەدەسرەوتی؟
دە پێم بڵێ
لەپاش ئەوەی

تەمەنێکی پڕ جوانیمان
لەگەڵ یەکتردا بەسەربرد
بە گوتەی کێ، بوویە دوژمنی ئەو عەشقە و
هەموو شتێکت لە بیرکرد؟..

کوردستان-هەولێر
25.2.1996

## هەنگاو

دەڕۆم، ڕێگام
سەخت و دژو بێ ئاسۆیە
چاوی هەستم
بەم مەملەکەتە نامۆیە
دڵنیابە لەهەر کوێ بم
بەیادی تۆ, بەرەو لووتکە هەنگاو دەنێم
تۆ سوڵتان و
فەرمان ڕەوای شیعرەکانمی
لەوە زیاتر چیت پێ بڵێم؟!..

کوردستان-هەولێر
15.5.1996

## ئێوارەیەك بەیادی تۆ

زەردەپەڕە و
دونیا ڕەنگی
فرمێسکی منی گرتووە
بەجۆرێک نوقمی تەنیاییم
وا هەست دەکەم، هەولێر بەجارێ مردووە
چۆن دەروونم گڕ نەگرێت و
بۆن سووتانی لێ هەڵنەستێ
کە چواردەورەم بوختان بێت و
هومای ڕاستیش
لەم هەوارە ڕانەوەستێ
تۆ ڕۆیشتی و
منت لە شارێک بەجێ هێشت
عەشق تێیدا
بێ ڕەواج ترین کاڵایە
جاران ئاخم بۆ غەریبیت هەڵدەکێشا
بەڵام ئێستا
ئێرةش بۆ ئێمة مةنفاية!...

کوردستان-هەولێر
20.7.1996

# جوانترین خۆزگه

هۆ منداڵە بێ نازەکان
بە دەستمبا
بۆتان دەبوومە پێخەف و
لە سەرماو سۆڵی زستانا
لە ئامێزی خۆم دەگرتن
یاخود شەوان
لەگەڵ سۆزی لایلایە دا
ئێشکم دەگرت، تا دەنووستن
بە دەستمبا
چی خوێن ڕێژو جەللاد هەیە
بە شمشێری غەمەکانم سەرم دەبڕین
تاکو ئیتر دروست ببا
شارێک لە گوڵ
ماڵێک لە جوانی و لە ئەڤین
حەسرەتی زۆرم لە لایە
بە دەستمبا
هەموویانم دەهێنادی
خۆشم ئیتر
ڕەها دەبووم
لە زیندانی نائومێدی
بەڵام ئەی ئەو خۆزگە گەورەی

له پێناوت
سەروماڵمان کردە فیدات
کوانێ وەفات؟
بۆ لە سایەی تۆ نەبووینە
خاوەن ئاڵا، خاوەن وڵات؟!..

کوردستان-هەولێر
1.8.1996

## هەواری گریان

تۆ شایانی ئەو ئەڤینە گەورە نەبووی
لە دڵم نەخشەم بۆ کێشا
پەشیمانم
لەو هەناسە پڕ ئاهانەی
کە بۆ دووری تۆم هەڵکێشا
پەشیمانم لە ناسینت
لە یەکەم ساتی بینینت
پەشیمانم
کە پێم گوتی
یان بۆتۆمە، یان بۆ گڵم
تۆش بە درۆ
هاتیە وەڵام و پێت گوتم
(منیش هەروامە ئەی گوڵم)
بڕۆ ئیتر
ماڵی دڵت
پڕ لە وەرین وخەزان بێ
تەزووی خۆشیت
هەموو کاتێک لە پچڕان بێ
بڕۆ کچێ، هیوام وایە
چڵی ویستم
لە باغی تۆ نەڕوێتەوە
جارێکیتر گوڵی خۆزگەم
بە شەماڵی ڕقی ڕەشت نەشنێتەوە!...

کوردستان-هەولێر
29.8.1996

# گرێ کوێرەکان

لەم وڵاتە
ناسنامەمان
شەڕو نەفرەت و کوشتنە
کار و پیشەی ڕۆژانەمان
تەرم بە خاک سپاردنە
ساڵەهایە چواردەورمان
بە ئاگرو جەنگ و وێران بوون تەنراوە
بووکی بەهاری بەختیشمان
تارای سپی لێ دزراوە
ناڵە ناڵمان
دەگاتە هەموو شوێنێک و
هەموو کونجێکی سەر زەوی
بە تەنیا خوا گوێی لێ نیە
ئەویش لەبەر مەستیی شەوی
ئاهـ خودایە
کەی تۆ بە ئاگا دێیتەوە؟
لەم تێچوون و خەراباتە
ئاوڕێکمان لێ بدەیتەوە؟!

کوردستان-هەولێر
**4.9.1996**

# پەیامی دڵ

هۆ کچی شەنگ
ئەمجارەیان گەشتی حەزم
بەرەو شاری دڵی تۆیە
نازانم بۆ
پاسەوانی دەرگای دڵت
هێندە ڕوو گرژ و نامۆیە؟

کوردستان-هەولێر
4.9.1996

# پێکی دووری

بیرتان دەکەم
بەبێ ئێوە
لێو بۆ پێکی شادی نابەم
هەموو شەوێ، لە ڕەشماڵی غەم نشینی
یادە ناخۆش و تاڵەکان
فرمێسکی سوور هەڵدەڕێژم
بۆ یادگارە بێ باڵەکان
دڵنیا بن
دڵم لەگەڵ دڵی ئێوە
هەموو کاتێک لە سووتانە
ڕێگای نەجاتم بزرە و
پڕ لە پرسە ولێقەومانە
خۆ دەزانم خەمی ئێوە
تێکەڵاوە
لەگەڵ ریتم و ئاوازی شەڕ
هیواکانتان
ئەسیرێکن
بە دەست دەنگی ناسازی شەڕ
من حەز دەکەم
لە تەکتاندا
خەبات بکەم بۆ ئایندە
ئەو ئایندەی

ڕێگاکانی
سەخت و هەڵدێر و بڵندە
بەڵام چیبکەم
چۆن بتوانم هەنگاو بنێم لە وڵاتێ
تفەنگ پێشەنگی ژیان بێت
هاواری کەسی نەگاتێ؟!..

کوردستان- بانە
19.9.1996

# سەفەر

زۆر دەترسم
هەتا لەم سەفەرە دوورەی
یاخی بوونی خۆم دێمەوە
منداڵێکی
وەک خۆت چاوڕەش و خنجیلە
لە ئامێزت بدۆزمەوە!
ئێستا لێرە
لە مەرگێکی بێ ناونیشان
گوڵستانی شادومانیم
بۆتە وەرزی گەڵاڕێزان
ئەو ساتانەی
بیری ڕۆژانی ڕابردوو دەکەمەوە
یادەکانت
بەرەو مەستیی و
ناخی غەمم دەبەنەوە!
نازانم چۆن
دڵم توانی
ماڵئاواییت لێ بکات و جێت بهێڵێ؟
یاخوا ئەوەی
لەیەکی دوور خستینەوە
وەکو ئێمە بکەوێتە
کونجی گرتووخانەی وێڵیی

دڵنیابە
ڕۆژێ دادێ دەتگرمەوە
لە ئامێزی ساردو سڕم
ئەوسا گوڵم
بۆت هەڵدەڕێژم سکاڵای
دڵی پڕم!..

کوردستان- بانە
30.9.1996

# ئاواتی بەیەك گەیشتنەوە

گەر نەشمرم، تا دێمەوە
غەمی دووری و چاوەڕوانیت هەر دەمکوژێ
هەموو کاتێک
سۆزی دڵم خوێناویە و
ئەشکی دوورییت بۆ دەڕێژێ
لێت دوورم و
ڕاستە وەک جاران ناتبینم
بەڵام قەسەم بە دووری تۆ
ئاوێتە بووی
لەگەڵ خوێنی دڵ و جەستەی ئاگرینم
گیانە هەرگیز
وامەزانە لە یادم چووی
جارجار بێنەوە بەرچاوت
بۆ تەمەنێک
قیبلەگاهی ئەوینم بووی
جا چۆن دەبێ
منی غەریب و بێ وڵات
خوا نەکردە، لە بیرم چێ
عەشقی سەوز و ئاڵ و واڵات؟
نا نا ئازیز
دڵ، هەر دڵەکەی جارانە
هەر پابەندی

عەشقی خاک و نیشتمانە
من ناگۆڕێم
هەرچی سۆزو وەفا هەیە، لەلای منە
ئەڤینی تۆ لەناو دڵم
ئۆقیانوسێکی بێ بنە
هەرچەند ڕۆییم
بێ ماڵئاوا بەجێم هێشتی
لە پاشی خۆم
پێکی شادیم لەدەست ڕشتی
قەدەر وای دەخواست ئەزیزم
هەر دەبوایە جێت بهێڵم، بە ناچاری
چونکە ژینم ئاگرێک بوو
طلثةى دةكرد، لة بيَزارى
بەڵام ئێستاش
هەتاکو ڕۆژی مردنم
هەر چاوەڕێی شادبوونەوە و
شەوی پەردە و
ماچی بەیەک گەیشتنم!..

کوردستان- ساباڵغ
9.10.1996

## هەرەس

ئەوەندەی من وێڵ بووم بە دوات
دێوانە بۆ شەمی شەوان
بەقەدەر من شەیدا نەبوو
دەریایەکم
ئەشکی خوێنین کردە فیدات
بەڵام هەمووی بەفیڕۆ چوو
ئەو کاتانەی
لەسەر ڕێگات دەوەستام و
چاوەڕێ بووم شەمعی کوڵمت بەدەرکەوێ
لات فەرامۆشی و نەنگیی بوو
پێم دەگوتی
دڵم بەبێ تۆ ناسرەوێ
نەهاتی، تا
لە پایزی تەمەنماندا
دوایی بێنین بە تەنیایی
ئەی هەمیشە خۆشەویستم
نەرمە کچی لەخۆبایی!...

کوردستان- بانە
30.10.1996

# نـــــاو

نازانم نا، چیت ناوبنێم؟
پێت بڵێم گوڵ
دەترسم هەڵوەریێی ڕۆژێ
پێت بڵیم دڵ
دەڵێم نەوەکو بە تیری ئەڤینی تۆ
بمرم، خوێنی دڵم بڕژێ
ئەی باشە بۆ پێت نەڵێم گیان؟
نا نا گیانیش
ڕۆژێک دادێ، هەر دەردەچێ
جا ئەو کاتە
دڵی تەنگم ڕوو لە کوێ کا؟
مەلی عەشقم بۆ کوێ بچێ!
نەء، ناوت لێ دەنێم بەفر
چونکە وەک بەفر بێگەردو نەرم و سپی
بەڵام بەفریش دەتوێتەوە
دەچێتەوە باوەشی ڕووبار، بە کپی!
نا، دەزانی چیت ناو دەنێم
لەمڕۆ بەدوا، پێت دەڵێم ماچ
پێم خۆشە لەسەر ناوی تۆ
تیرۆر بکرێم، بدرێم لە خاچ!..

کوردستان- بانە
**15.11.1996**

## شەرابی تەمەن

لە گوڵزاری شیعرەکانم
تاجی ئیمپراتۆریەتێکم لەسەر نابوو
ئەڤینی ئەو
بۆ تینویەتیم
کانیاوێکی بێ هاوتا بوو
کە دەمبینی
هیواکانم تێکەڵ دەبوون
بە ڕووباری چاویدانی
کەچی ئەویش
لووت بەرزانە
لە سەرو ڕیشی وەک بەفرو
ڕوخساری منی دەڕوانی
ئارامم گرت
گوتم بەڵکو ڕۆژێک دابێ
شەماڵێکی پڕ مۆسیقای
عەشقی منی بە دڵ دابێ
کەچی تەمەن
گوڵی گەنجیی هەڵوەراندم
ڕۆژگار خەندەی چاوەروانیی
لێ تۆراندم
ئەو نەهات و، لە کلێسای بۆ یەکتربوون
شەڕابی تەمەن نۆش بکەین
بەم هەواڵە
دڵی دۆستانمان خەندان و
هی ناحەزان، پەرۆش بکەین!..

کوردستان-هەولێر
8.2.1996

# سزا

من ئێستاکەش لەدەستم دێ
وەکو خاڵە پەشێوەکەی لەمەڕ خۆمان
هەلقەی پەنجەت
لێ بکەمە تۆپە گڕێک
بسووتێنێ ئەو پەنجانەی
وەکو شیعر تێم ئاڵابوون، چوار ساڵی ڕێک
کەی ئارەزووم بێ بتکوژم
دەرگا زۆرە بۆ کوشتنت
چونکە ئێستا
شەقامەکانی ئەم شارە
هەمووی بوونەتە دوژمنت
دڵنیامە، لە دواڕۆژیش
هیچ ویژدانێک
چاو ناپۆشێ لەم تاوانەت
لە سزای من
بە ئاشکرا
گڕ بەردەدەن لەم چاوانەت!...

کوردستان-هەولێر
27.2.1997

# بەندەری ناکامی

ئەی پێنووسە شکاوەکەم
هاوڕێی شەوانی تەنیایی و
چرای گەشی کەلاوەکەم
ئەمشەو هانام
وەبەر ڕاستگۆییت هێناوە
کێ وەکو من
پەرێشان و دڵسووتاوە؟
چی شیعرم بوو
لە پێناوی ئەڤینێکدا
کردمە خەڵات
لە ئەنجامدا ئەم ئەڤینە
نەیگەیاندم
بە بەندەری خەون و ئاوات!..

کوردستان-هەولێر
28.2.1997

# ئەگەری شادبوونەوە

گەر ئەمجارە گەڕایەوە
دڵنیابە جارێکیتر
ڕێگا نادەم زویربی لێم
چاوانم دەکەم بە مۆم و
بێ پەروایی بۆت دەسوتێم
ئەی ئافرەتە گوڵ ڕەنگەکە
چۆنت دەوێ و ئارەزووتە
وا وەرەوە
سەرێک بدە و
مێخەک بەندە جێماوەکەت، ببەرەوە
یان وەرەوە بە یەکجاری
مەرگستانی ئەم مەنفایەم، پڕ ژیان کە
یاخود چرای چاوەڕوانیم
بکوژێنەوە و
پف لە مۆمی تەمەنێک ئەشک و سووتان کە!..

کوردستان- هەولێر
31.3.1997

# شەرم

شەرم مەکە
چیت مەبەستە بیدرکێنە
لەمە زیاتر
دڵی بێ ئۆقرە و ئارامم
لە شەپۆڵی بێ دەنگیتدا, مەخنکێنە
شەرم مەکە
جارجار بپرسە و بزانە
بۆ لەسایەت، پەرتەوازە و پەشێو دیارم
بپرسە ئاخۆ بۆ کێیە
وا لەخۆم و
لە ژیانی خۆم بێزارم؟
نا گوڵی جوان شەرم مەکە
کۆتی بێدەنگیی چەند ساڵەی خۆشەویستیت
لە ئاستی مندا بپسێنە
ئاوێتەمبە و
واز لە پرسەی جاران بێنە
دڵنیابە
**باخچەیشیعری پاراوی من**
**پر لە گوڵی ئارامیە**
لە تۆی خۆشەویست بترازێ
کەس تیایدا

خودان هێزو توانا نیە
هەمیشە من
لە عەشقی تۆ، ژینم ژانە
دڵم تامەزرۆی ڕۆژێکە
وشەی ئەڤین
ببیستێ لەم دوو لێوانە
دەتۆش ئەی کچ
کچی شەرمن
بەس بێ پەروا بسووتێنە
دڵ و دەروون و جەستەی من!...

کوردستان-هەولێر
7.6.1997

# یاخی بوون

طولی هەولێر
گەر پابەندی عەشقت نەبوام
منیش لێرە
لەم وڵاتە وێرانەدا
نەمدەتوانی ئۆقرە بگرم
گەرتۆ نەبوای بۆ سەبووری و دڵنەواییم
ئێستا کوێربوو چاوی شیعرم
بەڵێ گیانە
گەر لەترسی
تراژیدیای فیراق نەبوا
ئەو چەتانەی عەشقیان کوشت
دەمێ ساڵ بوو
گڕم لە باڵاو تفەنگی
یەکە یەکەیان بەردابوو
ڕۆیشتبووم
لە حزووری شەوی بێ ڕێی سەفەرێکدا
چۆکی لەرزۆکم دادابوو!...

کوردستان-هەولێر
15.6.1997

## نزا

کەی ئارەزووت بوو بێیەوە
دەرگای دڵم لەسەر پشتە وەکو جاران
لەمێژ ساڵە، چاوەڕێمە
تۆ بێیتەوەو
شەوی یەڵدام، بکەیەوە بە چراخان
لەو ڕۆژەوەی
بڕیارتدا جێم بهێڵی
منی شێتیش بڕیارمدا
سووتان بکەمە هاودەمم
بۆیە ئێستاش
دەروێشێکی دەف هەڵگری تەکیەی غەمم
هۆ کچۆڵە شیرینەکەی
ساڵانی زووی خۆشەویستیم
نامەکانت
ئێستاش شەوان، دەمگریێنن
ئەو وشانەی بۆت نوسیبووم
لە پەنجەرەی شەوی خامۆشی و بێ دەنگیم
هێرش بۆ جەستەم دەهێنن
من نازانم چۆنت توانی
ڕێگای ڕق و بێ وەفایی بگریەبەر؟
چۆنت توانی

جێم بهێڵی و ئاوێتەمکەی
لەگەڵ زام و ناڵەو کەسەر
دەوەرەوە
گوێم هۆگری
چرپەی هێمنی دەنگتە
چاویش تامەزرۆی دیداری
گوڵ وەنەوشەیی ڕەنگتە
دەوەرەوە
تاکەی مەرگ
دەستەو یەخەی خۆزگەمان بێ
لە تەنیایی
تاکەی بتلێینەوە بە دەست
ئێش و ئازاری جودایی؟!..

کوردستان-هەولێر
2.8.1997

## وەرزەکانی چاوەڕوانی

پایز گەڵای
دارستانە بێ باکەکان دەوەرێنێ
بە چەپۆکە ڕەشەکانی
لق و پۆپی دار گوێزەکان تێک دەشکێنێ
کە زستانیش
بەفرو کرێوە دەهێنێ
خەندەو خۆشی
لەسەر لێوی دڵدارەکان دەتاسێنێ
لە دواییشدا، بەهاری شاد
بە ئەسپایی دێتە پێش و
سەر دەردێنێ
بولبول لە عەشقی گوڵەباغ
سەما دەکاو
بە ئاوازە بەجۆشەکەی دەجریوێنێ
کەچی ئەسەف
دڵداریان تاسەر نابێ و
گەرمای هاوین
گوڵ و ڕەیحان سیس دەکات و
دەژاکێنێ
گیانە منیش
ئەو هەموو گۆڕانکاریە

بۆیەک چرکەش ئازارم لێ ناڕەوێنێ
دڵی شێتم
لە دووری تۆ دەناڵێنێ
هەموو ڕۆژێک، لە ناخەوە
زامێکی نوێ سەرهەڵدەدا و
دەمگرییێنێ
نزا بۆتۆ فریام کەوە
شەپۆڵی غەمی فیراقت
وا خەریکە
نزیک دەبێ و دەمخنکێنێ!....

کوردستان-هەولێر
30.8.1997

## گوناه

لێم نزیک بووی
وەکو شیعر، وەکو ناوم
هێندە عەشقی خەوی باوەشی گەرمت بووم
تا وای لێهات
بوویە خەو و
ڕژایتە نێو پێڵووی چاوم
حەزم دەکرد خۆشەویستیت
سەنەمێک با، بۆ پەرستن
وام نیازبوو
بتکەمە ڕووگەی ئەڤین و
بێ تۆ نەژیم تاکو مردن
چەخار ئەتۆش
لە ڕەهەندی خۆشەویستی نەگەیشتی
بوویە خەوێکی ئەبەدی و
لە دۆزەخی
شەوانی گڕ تێبەربوونم نەڕۆیشتی
گوناهت کرد
لە ئێوارەی
وەرزی خۆزگە و چاوەڕوانیم
گڕت بەردا، لە فەرهەنگی وشەی هەستم
وێنەی پشکۆ
هاتی گازت گرت لە جەستە و

دڵی بریندارت گەستم
بەڵام گیانە
وانەزانی بە دڵ ڕەقیت
گڕی عەشقت
لە ناخمدا دەکوژێتەوە
واتێنەگەی
کۆرپەی هیوام لە داخی تۆ
بێ ئومێد سەردەنێتەوە
نا، مەحاڵە
تا بمێنم
نیگات لە چاوم ون نابێ
گەر سەد هێندە خۆشەویستیت
ئازارو غەم و بەڵابێ!.

کوردستان-هەولێر
15.9.1997

## دوای بەجێمان

ماوەیەکە لە سووتانی
شەوی عەشقم، خۆت دەرناخەی
وەکو جاران
بەسەر شۆستەی زامی سەختم
هەنگاوەکانت سەرناخەی
لەو ڕۆژەوەی کە ناتبینم
لەشکری غەم
لە گشت لایێ، شاری دڵمیان تەنیوە
مەلی سپی بەختەوەریم
بە ئاسمانی
ئەم کۆچە پڕ لە ئازارەی تۆ، فڕیوە
گیانە کە تۆ
جانتای سەفەری نادیارت
کردە شان و، خۆت ونکرد لێم
منیش پاش تۆ
بڕیارمدا هەوار چۆڵکەم
وەکو مەجنون، بیابان بێ مەسکەن و جێم
گەر بێ تۆییش
چاوی غەریبیی پێ لێکنام
لە ناخەوە
هەر دەژیم و هەر بەتەمام
لێت یەقین بێ
گەر بوویە شەم
وەک پەروانە، بە دەورتدا دەخولێمەوە
گەر بوویە ئاو

تینووی سەفەرێکی دوورم
دەتخۆمەوە
ببیە باران، هەرهیچ نەبێ
کێڵگەی دڵم پاراو دەکەی
ببیە میوە
دەستەو ئەژنۆ بەدیارتەوە دادەنیشم
چاوەڕێتم، تا پێدەگەی
ببیە شەڕاب
تا مەست دەبم فڕت دەکەم
پێک لەدوای پێک دەتنۆشم و
کە خاڵیش بووی, سەرلەنوێ پڕت دەکەم
ببیە ئاین
ناچار دەبم بتپەرستم
ببیە پێنووس
باڵای جوانترین هەڵبەستم
لە هەرکوێ بی، بەدوات وێڵم
تا نەتگەمێ ناسێمەوە
گەر ڕێگەمدەی
لەبەر دەرگات هەڵدەکورمێم، ناڕۆمەوە
چونکە گیانە
ژیان بێ تۆ
وەک زیندانێکی کپ وایە
زستانێکی یەکجار سەختە
پڕ کڕێوە و
زوقم و سەرماو ڕەشەبایە!..

کوردستان-هەولێر
**7.11.1997**

## ئاتەشگەدەی خەیاڵ

یادت بەخێر، ئەی ئەو کەسەی
بۆ یەکەمجار
ڤاڵیۆمی عەشقت پێ خواردم
هۆ ئەو شۆخەی
گەورەترین سۆزو وەفات پێ سپاردم
جا لەپاش تۆ
لە ئاتەشگەدەی خەیاڵم
کامە ئیمام، زیکرو پێش نوێژم بۆ بکا؟
پاش نامەی تۆ
ئیتر تیژباڵ ڕاناسپێرم
نامەی نهێنی و خەتەرمان بێنێ و ببا
دوو ئەڤینداری بێباک بووین
ئامادە بووین
لە پێناوی یەکتریدا رۆحمان بەخشین
لە گۆڕەپانی سەردەمدا
زۆر نەمابوو
ئێمەش ناوبنرێین مەم و زین
تۆ مامۆستای
وانەی پەیڤێکی پیرۆز بووی
فێری پاکی و ماچ و پەرستنت کردم
لە ئاکامدا
دڵت بەرەو کانگای زام و

ژانی بۆیەک نەبوون بردم
دە خۆت بڵێ
چۆن ئەو ساتە، کپ و خۆشانەم بیردەچێ
بە تاسەوە
لێوم نزیکی لێوت بوو
یان جارجارە بە شەرمەوە
دەستەکانم نزیکی باغی سێوت بوو
نا گیانە نا
زۆر ئەستەمە بیرم بچێ
ئەو ڕۆژەی کە
بۆ یەکەم جار بە ترسەوە پێک گەیشتین
بە پەرۆشیەوە پێت گوتم
(بیرت نەچێ
هەردووک ڕێبواری یەک گەشتین)
بەڵام ئازیز گەر دەتزانی
ئەو گەشتەمان بەیەکەوە نابەینە سەر
بۆچی هێشتت
پیرە کەشتی هیواکانم
لە کەنارت بگرێ لەنگەر؟!.

کوردستان-هەولێر
26.1.1998

## زۆنگاوی موحیببەت

ئەی پێشمەرگە
قارەمان و بەجەرگەکەی
ڕاپەڕینە بۆ ئەنجامەکەی ئەڤینم
ئەی ئەو کەسەی
بوویە ناوم، بوویە شیعرم
بوویە سەرچاوەی ڕوانینم
خۆ بیرت دێ؟
ڕۆژانێک بوو دەتگوت گیانە
ژیان بێ تۆ، ناخۆشترین ئەشکەنجەیە و
هەمووی ئەشک و جەفاو ژانە
ساڵانێک بوو
لە کانیاوی
لێوی یەکتری نەبوایە
تینویەتی خۆمان نەدەشکاند
لە ژووانێکی کپ نەبوایە
ڕازەکانمان نەدەدرکاند
ئەی تۆ نەبووی فێرت کردم
لەتۆ زیاتر
کەسێکی ترم خۆش نەوێ؟
بە ئاوات بووی هەموو شەوێک
سەری کاسم لە باوەشی گەرمت بنوێ
لەوەتەی لێت بێ هەواڵم

چاوی عەشقم لە گریانە
خونچەکانی گۆنای تەمەن
دووچاری سستی و خەزانە
کە خەیاڵی تۆ دەمگریَ
هەمدیس ژان وسەختی ومەرگ، دێنەوە ڕێم
وەکو دەروێش
بەدەم سەمای دەفی سینەم
حاڵ دەگرم و هەڵدەقرچێم
دەتۆش گیانە
نزیکتربەوە لە رۆحم
لەگەڵمابە، لەدڵمابە، لەچاوما بە
بۆ ڕووناکی
ئەم پچڕانی تەزووی عەشقە
لە قوڵایی هەست و سۆزو هەناومابە
دە گیانە دەی
وەکو جاران
بە بارانی ئەڤینی خۆت
پەرێزی دڵ تێرئاو بکە
لەم خەڵتانی ئەشک و ژانە دەرمبێنە و
بۆ زۆنگاوی
ماچەکانی خۆتم ببە...

کوردستان-هەولێر
7.2.1998

# گوڵی ژاکاو

ئەی شێرپەنجەی وەرزی گەنجیم
تۆ ئەوغەمە بێ سەرچاوەی
تادێ لەبەرچاوی عەشقم گەورە دەبی
چەقۆیەکی
هەموو ڕۆژێ بەبێ ژمار
لە تەمەنی سەرگەردانی من ڕۆدەچی
تۆ ئازارێکی نەبڕاوەی
تۆ برینێکی نەکراوەی
بۆ من مایەی
غەم و دەردو کارەساتی
کانگای هەزارەها زام و
ژانی دەیان بەسەرهاتی
تازە ئەوین لەگەڵ تۆدا
گوناهێکی زۆر گەورەیە
چونکە لەوەتەی لێم دووری
دڵم ئۆقرەو ئاسودەیە
کە تۆم خۆشویست
نەمدەزانی, ملوانکەی یادەکانی تۆ
بۆ ملی من
کۆت و کەلەپچەو زیندانە
لە ئاکامدا کۆرپەی شیعرم

بەشیناڵین و گریانە
نەمزانی نا
ڕۆژێ دادێ وەک قەرەجێ
ماڵی دڵم جێ دەهێڵی
بە ڕقی ڕەشی نەبڕاوەت
باغی هیوام تێک دەشێڵی
گەر دەمزانی
فرمێسکی چاوت درۆیە
پێکەنینم لە سایەتدا
بەهارێکی بێ گوڵزارو بێ چرۆیە
ڕێم نەدەدا
لە کەنار دەریای ئومێدم
ماڵێک بۆخۆت دروست بکەی
سوجدەیەکی گوماناوی
بۆ(لالش)ی ناخم ببەی
بەڵام حەیف
تۆ خەرمانێ درۆی گەورەت
لە چاوانت حەشار دابوو
پیرۆزیی عەشق لەلای تۆ، چی نەگەیاند
وەفاش لەلات
وەک گوڵێکی ژاکاو وابوو
بڕۆ هەرگیز جارێکی تر
پێ مەنێوە مەملەکەتی پرسەی هەستم
ئیتر میوان ڕاناگرم و
گوڵی بێ بۆن، هەڵاڵەی مۆن ناپەرستم
ئێستێکە تۆ، بەرامبەرم

سەرت شۆڕە و خەتاباری
لە زبڵدانی مێژووشدا
بەدەم ئاویلکە دانەوە
دەمێنیەوە
بە ڕیسوایی و شەرمەزاری..

کوردستان-هەولێر
22.4.1998

## یاداشتەکانی من و دۆڕاوێك*

نەفرەت لەخۆت و لەعەشقت
نەفرەتی خواش لەوانە بێت، هانیاندای و
بوونە سەرکردەو سەرمەشقت
چیت بەخۆت کرد ئەی سۆزانی
ئەی ئەو دۆڕاوە سەرشۆڕەی
ماڵی ڕەوشت پێ نازانی
کوردەواری ڕاستی فەرموو
تاس بشکێ، بەڵام نەزرنگێ
کە زرنگا، ئابڕوو دەتکێ!
تۆش وابووی وا
تۆش بەدەستی
مێبازەکانی ئەم شارە، ئابڕووت تکا
بە نیازی
هەوەس بازی، هەنگاوت نا
بەڵام هەیهۆ
شووشەی کەسایەتیت شکا
حەیف بوو کچێ، حەیف بوو
لە پێناوی حەزەکانت
داهاتووی خۆت
بە مشتێ دراو گۆڕیەوە

لەکەی ماچە نەوتاویەکانی ڕوومەتت

بە تفی دوای

کۆتایی جووتبوون، سڕیەوە

ئیتر بڕۆ

ئەم ڕوو ڕەشی و سەرشۆڕییە

هەر بۆخۆت جوانەو، پیرۆزە

باش بزانە

دیاری و پیرۆزبایی منیش

کۆمەڵێک تفی بەسۆزە

تف لەخۆت و

تف لە وەفا و

تف لە ناوت

تف لەو ڕۆژە ڕەشانەش بێ

بە نەزانی کەوتمە داوت!

بڕۆ بۆخۆت

بەدوای هۆش و

مرواریە ونبووەکانی

ملوانکەی هیوا بکەوە

لاپەڕەی پڕ لە ڕووڕەشیت

بۆ حزووری مامۆستاکەت ببەرەوە

شورەییە و

واز لە درۆ و

سواڵکردنی ڕەوشت بێنە

**لەوە زیاتر**
**لە قومارخانەی سەردەمدا**
**نازناوی خۆت مەدۆڕێنە!....**

*سەرەڕای خوێندنەوەی جیاوازم بۆ چەمکی شەرەف و ڕەوشت و، ئەو دەستەواژانەی کە تەنیا لە کۆمەڵگا خێڵەکی و دواکەوتوەکاندا باوی ماوە، حەزم دەکرد لەجیاتی ئەو گوزارشتە نزم و، دەربڕینە نەشیاوانە بۆ ئافرەتێک (کە هەرچیەک بێت، مرۆڤە)، سەرتاپای ئەم هۆنراوەیەم گوڵاوڕێژ بکردایە بە وێنەی جوان و پەیڤی پڕ لەسیحری شیعر، بەڵام کاتێك دڵدار هەست دەکات, وا خەریکە لە تونێلی خیانەتدا، بەدەستی دڵبەرەکەی غافڵ کوژ دەکرێت، ناچاردەبێ بەم زمانە توندە بدوێت!!.

**کوردستان- دهۆک**
**29.4.1998**

# پەیکەرێکی رووخاو

لە ئەمڕۆوە
لە مانشێتی شیعرەکانم
بە تاوانبار ناوت دێنم
پەیکەری ڕەشی ژەنگ گرتووت
لە شەقامی چۆڵی هەستم, دەڕوخێنم
تازە بۆم ڕوون دەبێتەوە
چ ڤایرۆسێکی کوشندەو، چ ژەهرێکی
جارێکی تر
چۆن چۆنی ڕێگات پێ دەدەم
وەکو جاران خوێنی جگەرم هەڵپێێکی!
دڵنیابە لێت نابوورم
تادێ ڕقم بەرامبەرت زیاتر دەبێ
تووڕە بوونم
بەم زووانە، وەک نارنجۆک
بە ڕووی ڕەشتدا دەتەقێ
جا ئەوساکە
پەشیمانی و فرمێسکی چاو دادت نادات
هاتنە سەرڕێ و
پاڕانەوە, چارت ناکات
دەبێ بمری و کە مردیشی
مەیتخانەی هیچ دۆزەخێک بەخۆت ناگرێ

هەموو شتێک
لەم بێ وەفاییەت دەتۆرێ
لە کۆتایی جەنگی نۆیەمینی عەشقم
تۆش مەدالیای
شەهیدێکی شەرمەزارت پێ بەخشرا
خوێنی جەستەی
پڕ لە ساختەو سەرابیشت
بەلاغی ئەم هۆنراوەیەی، پێ نەخشرا!.

کوردستان-هەولێر
1.6.1998

## حەزێکی بێ هاوتا

عەیامێکە وەکو جاران
هەست ناکەم گەرمی هەناسەت
چاو لە ڕێگاو دەستەو ئەژنۆم
وام بەتاسەت
کزەی جەرگم
نەتدەزانی ئەگەر بڕۆی
بەهارو گوڵ لێم دەتۆرێن؟
ئەستێرەکان بەرەو ناخی
سووتانێکی بێ ئەندازە، دادەچۆڕێن
خۆتۆ گوتت تۆران لەتۆ
تاوانێکی زۆر گەورەیە و، لووتکەی مەحاڵ
بۆتۆ دەژیم، بۆتۆ دەمرم
تا ئەو ڕۆژەی
کۆرپەی حەزو بۆیەک بوونمان
دەکەوێتە دونیای شیرینی گڕوگاڵ!
هەموو کاتێک
لە خەڵوەتگای ئەڤینداری
بێ وچان دەپاڕایەوە
بۆئەو حەزە بێ هاوتایە
بە چرکەیەک
هەزاران جار، خۆت دەکوشت و دەژیایەوە
پەرێشان بووی ئەگەر ڕۆژێک
لە پەنجەرەی چاوانتەوە دەرنەکەوتبام

یان لەکاتی چاوەڕوانی
بەسەر پەیژەی
دڵی تینووت سەرنەکەوتبام
مودەتێک بوو منی قەرەج
لەم شارەدا، لە ماڵی عەشقت بترازێ
داڵدەی ترم شک نەدەبرد
هەتا بەتۆ نەگەیشتبام
سۆزی ژان و، ئەشک و هەڵچوونم نەدەمرد
ئەی ئێستا بۆ
وەکو جاران، بە برژانگی چاوەکانت
جەرگ و دڵم زامدار ناکەی؟
بۆچی بارگەی سەفەرێکی تاهەتایی
لەم وێرانەی دڵم ناخەی
وەرە مەڕۆ
بۆ شەماڵی چرپەی شیعرم، دەتارێنی
بۆچی کوختی
ئاسودەییم، دەڕوخێنی
کچێ گوڵم
چۆن دڵت دێ تەنیام بکەی
لەم دۆزەخ و ڕق بارانە
ئەی نازانی منیش بێ تۆ
بەشم ئاهـ و، هەناسەی ساردو گریانە؟!.

کوردستان-هەولێر
13.6.1998

## نەشکاندنی شووشەی پەیمان

لێم ببوورە
ئەگەر بڵێم مەبەستم نیە لە پێکی
چاوەکانی تۆ هەڵبدەم
نامەوێ بتکەم بە بت و
وەکو بەندە کڕنۆشی عەشقت بۆببەم
بمبوورە ئەگەر لە شیعرا
بە دڵدار ناوم نەبردی!
گەر ڕۆژێ هات، لە حەسرەتی بۆتۆ بوونم
سەری خۆت نایەوە و مردی
من چۆن بۆتۆ
دەستبەرداری ئەڤینێک بم
ساڵەهایە تێکەڵاوە لەگەڵ خوێنم
چۆن دەتوانم
پەیمانی عەشق بشکێنم!
ئیتر پەری
ئەی ئەو کەسەی
لەمن زیاتر شەیدای شیعری
لە نزیک چەمی خەیاڵم
ڕەشماڵی سۆزت هەڵمەدە
بەسە چیتر
بەسەر خەرمانی گڕگرتووی ناخی گەرمم
شەماڵی نازت هەڵمەکە

من وتۆ، دوو ڕێبوارین و
بۆیەک بوونمان هەرگیزنابێ
نێوان من و تۆی ناتەریب
یەکجار سەخت و دوورە، ناشێ
دڵنیابە
بە تۆفانی عەشقی وێڵت
گڕی دڵم ناکوژێتەوە
بە کلیلی کۆنەساڵی دەستی نەرمت
دەرگای دڵم ناکرێتەوە
من تۆبەداری عەشقێکی بێ ناسنامەم
دەزانم تۆبە بشکێنم
خودای شیعر لێم دەتۆرێ
هەموو شتێک
لە سیستەمی وەفاداریمدا، دەگۆڕێ!..

کوردستان-هەولێر
19.8.1998

## چارەنووس

هەتا بارگەت
لە کۆڵ نەنا و، جێت نەهێشتم
نەمدەزانی ڕۆژانێک دێ
ماسی لە ڕووبار دەتۆرێ
نەمدەزانی
دەروێش تەکیەی جێ دەهێڵێ و
بولبول لە بەهار دەتۆرێ
گیانی شیرین
چۆنت توانی لە دڵی خۆت دەرم بێنی
بە تەنیایی سەرهەڵگری و
لەناو دەریای چاوەڕوانی بمخنکێنی
چاک دەتزانی گەر دوور بڕۆی
بێ تۆیی، چیم بەسەر دێنێ
ڕەگ و ڕیشەی بەختەوەریم
لە ناخەوە هەڵدەکێشێ و دەسووتێنێ
ئەدی گیانە
بۆ ڕۆیشتی و
بە ئەشک و ژانت سپاردم
بە زۆرداری، تاڵاوی عەشقت پێ خواردم
لە زووەوە من دەمزانی
دڵداریمان بە فەنابوون کۆتایی دێ
بە سەراب وئێش و ژان و
بە لەناوچوون کۆتایی دێ

ڕۆژگارێکی بێ وەفایەو
سەردەمێکی یەکجار یەکجار سەیرە گوڵم*
ئەمێستاکە
زەمەنی لێک دابڕانە و
گوڵ وەرێنە بۆ بەهاری ناخی دڵم
بگەڕێوە
تازە مەنفا
خۆشی نابەخشێ بە دڵت
لە باوەشی من بەملاوە
هیچ باوەشێک خامۆش ناکا
گڕی گریانی بە کوڵت
بۆکوێ دەچی
لە دۆزەخا، کوانێ ژیان؟
کەی زانیوتە
نەخۆش هەڵبکا بێ دەرمان؟
بگەڕێوە
منی پیری بە ساڵاچوو
دوور لەتۆ مەرگە ژیانم
کۆست کەوتەیەکی ڕەشپۆش و
ناتەریبم، لەگەڵ شیعرو یادەکانم
لێم مەتۆرێ و وامەزانە
ئەگەر دووربی
ئیتر مۆمی عەشقی ئێمە دەتوێتەوە
وامەزانە
ئیتر چرای چاوەڕوانیم
بە ڕەشەبای ئەم سەفەرەت دەکوژێتەوە

**نا دڵە نا**

**من ناتۆرێم، من ناگۆڕێم**
**دڵداریمان زۆر گەورەترە لە تۆران**
**عەشقی ئێمە**
**ئێستا گەلێ پیرۆزترە**
**لە سەردەمی جاری جاران**
**عەشقی ئێمە وەک خۆر وایە**
**گەر ئاواش بێ**
**بەرچاوانم تاریک ناکا و، هەڵدێتەوە**
**بۆیە ئازیز بێ گومانم**
**لە مەنفاشدا بێ ئەڤینم هەڵناکەیت و**
**ڕۆژێ دادێ هەردێیتەوە!.**

* ئەحمەدی شاملوو دەڵێ: ڕۆژگارێکی سەیرە گوڵم.

**کوردستان-هەولێر**
**15.12.1998**

## دراوسێ

لەم شارەدا
لەم شارە بێ بەهارەدا
لەم شارەی پڕ لە سانسۆرە
لەم شارەی کە
عەشق کەم و، ڕەقیب زۆرە
سەردەمانێک بوو من وتۆ
دڵمان بۆ یەک
هەستمان بۆ یەک
رۆحیشمان بۆ یەک تەرخان بوو
بۆ ڕەشبینی و نائومێدی
عەشق بەخۆداچونەوە و
وەرچەرخان بوو
تەنیا جارێک، ڕوانینمان لەچاوی یەک
سامانی هەموو دونیا بوو
لە ئەڤین و پاکیزەیی و گوڵ بترازێ
هەموو شتێک
لەلای ئێمە، بێ بەها بوو
لەبیرتە
دەمەو شەبەنگی ئێواران
خۆرەتاو بوایە، یان باران
چۆن بە نیگا
ئاوێزانی یەکتر دەبووین؟
هەر یەکەمان بە خەیاڵێ

بۆناو کەشتی
لەنگەر گرتووی عەشق دەچووین!
گوڵی باغان
دڵداریمان
جەربەزەیی و، ڕاپەڕین بوو
وەرزی لە ئامێزگرتنی
کەرنەڤاڵ و پێکەنین بوو
سەد مخابن
مۆمی ئەم یادە مەزنە
چرای ئەم حەزە هێمنە
بە هەناسەی
لەیەکتری حاڵی نەبوون، کوژایەوە
بادەی نزیکی لێوانمان
چەندین بارە ڕژایەوە
وامان زانی، کۆتایی وەرزی عەشقمان
پایزێکی بێ چرۆیە
بێ ئاگا بووین، نەمانزانی
سەردەم، سەردەمی مێزگردو گفتوگۆیە!.

کوردستان-هەولێر
13.9.1999

# کەلوو

وەکو ڕۆتینی ڕۆژانە
پەرۆشانە
سەیری ڕۆژنامەکەم کرد و
پەڕەکانیم هەڵدایەوە
هەتاکو، گۆشەی کەلوەکان
بە ڕووی مندا، کرایەوە
لە کەلوەکەمدا نوسرابوو
ئیتر خۆشبە
خەمی دووریت دەبڕێتەوە
بەمزوانە ئازیزەکەی
چەندین ساڵەی دوور لە ئامێزت، دێتەوە
ئیتر منیش
لەو ڕۆژەوە ئینتزارم
لەخۆشیا
شەویش نانووم، هەر بێدارم
دەڵێم دەبێ ڕاست دەربچێ و
دەرگای بەختم بکرێتەوە؟
ڕۆژێک دابێ ئازیزەکەم
بۆ وێرانەی دڵی تاریکم بێتەوە؟!..

کوردستان-هەولێر
2.10.1999

## هەمیشە گومان

گومانم لەو بایە هەیە*
کە قژی نەرم و زێرینت دەباو دێنێ
گومانم لەو خوایە هەیە
بێ ڕەحمانە
دڵی دڵداران دەشکێنێ!
بە گومانم
لە سروشت و لە بوونی خۆم
بە گومانم
لە زەردەخەنەی دەمی مۆم
گومان دەکەم
لەو هاوکێشەی
کە ناویانناوە هۆنراوە
گومان دەکەم
لە بەهەشت و لە دۆزەخیش
دەڵێن گوایە
بۆ خێر و شەڕ سازکراوە
گومان، گومان
گومان لە خۆم، لە ئەم، لە ئەو
گومان لە زەوی وئاسمان و
لە ڕۆژو شەو!....

*- لەتیف هەڵمەت دەڵێ:
گومانم هەیە لەو بایە.

کوردستان-هەولێر
14.10.1999

# دۆڕان

گوتم جوانێ
ئەڤین غەم و زەبرو زەنگە
گوتم ناسکۆڵ
ئەڤین پەت و هەڵواسینە، ئەڤین جەنگە
ئەڤیندارانە پێم گوتی
گەر دەزانی بەرگە ناگری
گەر دەزانی، ڕۆژێک دادێ
بۆ کپ بوونی چرای یاد و
هەڵوەرینی گەڵای سەوزی عەشق، ناگری
لە ئێستاوە ڕێگا نادەم
دەواری عەشقت هەڵبدەی
لە سەحرای ئەم دڵە تەنگە
لە ئێستاوە گوێ هەڵناخەم
بۆ ئەم نەوارە بێ دەنگە
لە یەکەم ژووان پێم گوتی
جیهانی هەست و سۆزی من
هەمووی مەرگ و تراژیدیا و کارەساتە
لە یەکەم دوان پێم گوتی
کەلاوەی عەشقی سەرەڕۆم

شوێنی دەیان داپڕان و بەسەرهاتە
کەچی تۆش، تامەزرۆیانە
گوتت قەینا دەتپەرستم
خۆشم دەوێی و بێ پەروام
لە درووشمی بەرزی هەستم
هەرزەکارانە پێت گوتم
گەیشتنم بەم جیهانە جەنجاڵەی تۆ
بۆ من لووتکەی
گەورەبوون و شانازیە
بەڵێ گوتت
ئاشنا بوونم، بەم زیندان و زەبروزەنگە
شکۆداری و سەربەرزییە
بەڵام هەیهۆ
تەلاری وتەکانی تۆ
هەمووی چۆڵ بوون، هەمووی درۆ
من ئێستاکە تێگەیشتم
لەم مەفتەنە
عەشق درۆیەکی زلە
ئیتر بەم جۆرە ئەڤینە، ئاشنا نابم
لەگەڵی دەکەومە، ملە
بۆم ڕوون بۆوە لەم وڵاتە
سامان بنەمای یەقینە
سامان بنچینەی ئەڤینە
ئیتر بێ هیوا دەبم لێت
جارێکی تر دانانیشم

لەبەر سەرمای شەقامی ڕێت
چونکە دڵت گۆڕەپانی
جەنگێکی پڕ لە دۆڕان بوو
بولبولی حەز لەسەر گوڵت
هەمیشە ڕوو لە تۆران بوو
کوا من عەشقم بەدی نەکرد
لەو درۆیەی خۆت ناوت نا
(خۆش ویستنێک
وەک گەورەیی دەریای بێ بن)
کوا من مەشقم بەدی نەکرد
لە میانەی خۆ سازدانمان
بۆ شاڵاوی پێک گەیشتن
تازە هەرگیز وەکو جاران، بە تاسەوە
گوێ بۆ هەواڵت هەڵناخەم
تۆ لەمەودوا
پێڵاوێکی کەم بەهای و
شورەییە لەپێت بکەم!
تۆ وڵاتێکی بێ ئاڵای
تۆ خەباتێکی بێ باڵای
تۆ شەهیدێکی بێ ناوی
تۆ دەریایەکی بێ ئاوی
تۆ ئێستاکە، لە ئاستمدا سەرت شۆڕە و
ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکی
خۆت دۆڕابووی
بۆ منیشت وەکو خۆت تووشی دۆڕان کرد؟

بە ڕەشەبای بێ وەفایی
ماڵی هەستت لێ ڕووخابوو
بۆ منیشت وەکو خۆت تووشی ڕووخان کرد؟
دەپێم بڵێ لە تۆڵەی چی
منت تووشی
ئازارو مەرگ و سووتان کرد؟
منت گیرۆدەی زیندانی
غەم و دەرد و دابڕان کرد؟!...

کوردستان-هەولێر
19.11.1999

## بژی خۆشەویستی

گیانی گیانان
لەو سەردەمی جیهانگیری و
تەکنەلۆجیا و داهێنانە
لەو سەردەمەی
کە پێشکەوتن
هوتافی زۆربەی گەلانە
کوانێ باوی سنوور ماوە؟
کوانێ نەخشەی ڕێی دوور ماوە؟
کوانێ دیوار، مانای هەیە؟
کوا دیدار و یەکتر بینین
پێویستی بە،ماندووبوون و ئیرادەیە؟
کەچی نێوانی من و تۆ
هەر بەتەنیا دە هەنگاوە
جورئەت ناکەین
کۆت و بەندەکان بپسێنین
سنوورەکان ببەزێنین
چرای بەیەکتر گەیشتن، هەڵگیرسێنین
ئیتر گوڵێ
وەرە پەیامێک دەربکەین
پەیوەندی بە عاشقانی وەکو خۆمان
دڵ بەغەم و کەسەر، بکەین
داوا بکەین لە گەورەی شار

فەرمان بدا، هەرچی زووە
بەربەستەکان تێک بشکێنن
ئەو سنووورە کارتۆنیانەی
بۆ لێک بوونی دڵدارەکان داندراوە
هەر هەموویان بڕوخێنن
ئەوسا عەشق
هەموو وڵات دەگرێتەوە
ئاسەواری نائومێدی
لە ڕووماندا دەسڕێتەوە
ئیتر ئێمەش
لەژێر ئاڵای خۆشەویستی
پێکی هیوامان نۆش دەکەین
ماچەکانمان, بە ئاوازی
عاتفی ترین سامفۆنیا، ڕووپۆش دەکەین
هەموو پێکڕا، کۆڵان کۆڵان
لەگەڵ عەشق، دەخولێینەوە
پڕ بەدەنگ و بە ویژدانمان
ئەم هوتافە دەڵێینەوە
بژی گوڵ و
بژی ماچ و
بژی جوان و جوان پەرستی
بژی عەشق و خۆشەویستی
بژی عەشق و خۆشەویستی....

کوردستان-هەولێر
1.1.2000

# یاد

مەخمور لانەی بیرەوەریم
کانگای خۆشی و
کەیف و شادی و دەردەسەریم
مەخمور کزەی دڵ و جەرگم
ئەی ناسنامەو
ڕەمزو ناو و دەنگ و ڕەنگم
(ئارەزوومە کە بێمەوە
سەر بەسەر سینگت نێمەوە)*
هەوای کوێستانت هەڵمژم
هەگبەی دڵمت بۆ هەڵڕژم
مەخمور ئێستا
تا چاو بڕکا، لەتۆ دوورم
جاران تەنیا دەرکراوی ئامێزت بووم
کەچی ئەمڕۆ پەڕاگەندەی
چەندین وڵات و سنوورم
مەخمور بێ تۆ
نامۆو بێکەس و غەریبم
لەگەڵ ئێرە
ئێرەی نا ئاشنا بە ڕۆحم، ناتەریبم
باڵەخانەی ڕەنگاوڕەنگ و
نیگای جوانان

وەک دیمەنت، ئۆخەی نابەخشن بە دڵم
دوور لە ئامێزی دایکانەت
هەتیوێکی
بێ هەوارگەو بێ مەنزڵم
قەرەچوغت
چاوگەی سۆزو فەرامۆشی و سەربەرزیمە
(بازاڕگە)و(ئاوی بن بەرد) ت**
مایەی هەمیشە شانازی و
گەورەییمە
(مەخمور)ی رۆح، من لەگەڵتام
لەگەڵ هەموو هەنگاوێکدا
یادت دەکەم، لەنێو دڵتام
ئەوان لەوێ دەستی پیسیان
بە خوێنی ئاڵت سوور بووە
منیش لێرە، لەداخی ناڵەو گریانت
ڕێگای هیوام لێ دوور بووە
هەرچەند جاری جەللادەکان
کۆرپەیەکی شۆرشگێرت لەدار دەدەن
منیش لێرە
ڕقی شیعرێک بۆ کرداریان
دەکەمە مەرگ و ئەهریمەن
مەخمور نازانم چی بێژم؟
غەمم ئەوەندە زۆر بووە
لەناو دەریای
مەرگی غەریبیدا، گێژم
بەچ هەستێک

نالّەی دڵی خۆم دەربڕم؟
بەچ دەستێک
ئەهریمەنی
ئازارەکانم سەربڕم؟
چ هێزێک هەیە بتوانێ
ئەتۆم لەیاد بەرێتەوە؟
ئەڤینی تۆ
لەسەر دیواری رۆحمدا، بسڕێتەوە!.

*- دێڕە شیعرێکی(حەسەنی دانیشفەر)ە.
**- ناوی دوو سەیرانگایە لە (مەخمور) .

سوریا- دیمەشق
18.3.2000

## ڕەشبوونەوە

گوێ بگرن لێم
ئەمجارەیان
بە زمانی ئاگر دەدوێم
لە دەڤەری
مردنێکی کوشندەو خەست
لە ئازارێکی بەبێ هەست
پەیامتان بۆ دەنێرمەوە
ڕاستیتان بۆ دەگێڕمەوە
ئێرە وڵاتی ونبوونی
کەسایەتی و، سۆزو هەڵوێستی ئینسانە
درۆ دەکەن
ئەو کەسانەی دەڵێن مەنفا
کانگای سەفاو، تازەبوونەوەی ژیانە
درۆ دەکەن
ئەو کەسانەی دەڵێن گوایە
لە هەندەران عەشق دەژی
پێکەنینیش دوایی نایە!
بەڵێ مەنفا
گەردەلولێکی سەرشێتە
هەموو کاتێک
لە بازاڕی فرۆشتنی جوانی تەمەن

چاوەڕێتە!
مەنفا مەرگێکی نەبڕاوە و
ئازارێکی بێ چەمسەرە
چامەی بە تاڵان بردنی
بەهای مرۆڤی، ئەزبەرە
مەنفا، واتا
پچڕان، فەوتان، ڕەشبوونەوە
لەگەڵ سەراب
جەنگ و هەراو، دانوستان و
دووبارە تێهەڵچوونەوە!

سوریا- دیمەشق
23.3.2000

## ئێوارەیەك لە دیمەشق

## رۆحم تەنیایی لێ دەتکا

جاران هەناسەی گیانم بووی
دەفی زیکری شەوانم بووی
چاوەکانت
ترپەیان بە دڵ دەبەخشیم
بڕوام وابوو گەر بێ تۆبم
نەک هەر نامۆ، مرۆڤیش نیم
ئەو سەردەمەی کە گەورەم بووی
بێ مانابوو خواپەرستی
دەمگوت ئەگەر، دڵم بڕەنجێ لە عەشقت
ناوی دەنێم بێ هەڵوێستی
بەڵێ ئەوسا
ئەگەر سنوورم ونکردبا
تۆ جوگرافیاو ئەتڵەسم بووی
کە خومارو مەستیش دەبووم
تۆ ناسنامەو
ڕێشاندەرو ئەدرەسم بووی
کە دڵدار بووین
حەزم دەکرد
وەکو هەلقە بمئاڵێنی لەنێو پەنجەت
هەرهیچ نەبێ

پەنجەکانت تەنیا نەبن و
جوانتر بکەم، لارو لەنجەت
حەزم دەکرد
بۆ لێوانت ببمە سوراو
بۆ بەهاریش، ببمە چریکەی بولبولت
یان خۆم بکەمە گەردانە و
شەتەکم بدەی لە ملت
ئەو چرکە ساتە خۆشانەی
بە تاسەوە، لەنێو باخچەی دڵداراندا
بەرامبەر یەک دادەنیشتین
یان کە پێکڕا
بە خەیاڵی عاشقانە
هەڵدەستاین و دەڕۆیشتین
ئەو کاتانە
چەند گوڵ ڕەنگی و، چەند هێمن بوون
باڵندەکان
سنەوبەرە بڵندەکان
ئاوێزانی ڕوخساری تۆو نیگای من بوون
بەڵام هەی داخ
لە ئاکامی
ئەو سیناریۆ سەرابییەدا
لەخۆبایی و بێ ئەمەک بووی
لە ئاست هەڵوێست و بەرائەت
داوێن پیس و، بەدنمەک بووی
ماڵت شێوێ

چۆن دڵت هات
لە سەفای عەشقی پەمەییت، بمتۆرێنی؟
ئەی بەڵێنت پێم نەدابوو
ببیە ئەندازیاری جوانی و
سەرتاپای نەخشەی ژیانم بگۆڕێنی؟
زیز بوونت لێم
هاوکێشەی درۆو ڕووڕەشی و
خیانەت بوو
رەفزی گوڵ وسەما و جوانی و
بەرائەت بوو
ئاهـ جەللاد ئاهـ
پێمان بڵێ، لە گرتووخانەی دڵتدا
چەند بێ خەتای وەکو منت
بە سێدارەی درۆکانت، هەڵواسیوە؟
یان بەرامبەر ئەم ناپاکیەت
کوا وەڵامت، چیت نووسیوە؟
چەند غافڵ بووم
دەبوایە هەر زوو بزانم
دڵداریمان
ئافاتێکی ئاوا گەورەی بەدواوەیە
تەلارێکی
لە ڕووکەشدا جوان و بڵند
لە ناویشدا کەلاوەیە!.

سوریا- دیمەشق
**14.4.2000**

## موژدە

ئەی ئەو کەسەی
وەفات سەرچاوەی تاقگەیە
خۆشەویستیت
پیرۆزمەندترین ڕووگەیە
موژدەت دەمێ
هاکا زانیت کە هاتمەوە
بۆ ئەو هەوارەی کە تێیدا
ئێوارانێ، خۆت و بوخچەیەک پڕلە سۆز
چوست دەهاتن بەلامەوە
درۆ دەرچوو پێشبینیەکان
درۆ دەرچوو چەمکی ئاوات
ئەو ئاواتەی کە مەنفا بوو
لە پێناویا، پاشەڕۆژم کردە خەڵات
بەڵێ خانم
ئەی ڕووناکی دیدەکانم
چاوەڕێبە، وا دێمەوە
زەمانێکە بۆ دیدەنیت
بە دەم مەرگ دەشنێمەوە
کە هاتمەوە لەسەر سنوور
کڕنۆش دەبەم بۆ چیاکان
بۆ خاک و خۆڵ، بۆ دەشت و چۆڵ
بۆ مەزراکان
کڕنۆش دەبەم، بۆ پردی زاخۆی دەلال و

بۆ قەڵات و بۆ منارە
بۆ ئەو منداڵە یاخیانەی
باوکەکانیان لە پێناوی نیشتماندا
وەستان لەبەردەم سێدارە
من هۆگری
زڕڕەی بازنی شەنگەبێری و
باعە باعی نێو مێگەڵ و، قاسپەی کەوم
بە چاوی تۆ
لە جاران زیاتر تامەزرۆی
سوار سوارانێ و
لە شان کردنی بڕنەوم
من ڕاهاتووم بەیانیان
لەگەڵ ئاوازی کەلەشێر بەئاگا بێم
خۆم ساز بکەم بۆ دروێنە و
تا نیوەڕۆ
لەبەر گەرما هەڵبقرچێم
بەڵێ گیانە
گەورەترین خۆشەویستی
خۆشەویستی نیشتمانە
بۆیە منیش
لە داخی دووریی نیشتمان
سەرتاپام بۆتە وێرانە!..

سوریا- دیمەشق
20.4.2000

## لۆجانا

شەو، شەوێکی
سەرماو سۆڵ و تەماوی بوو
بۆ عاشقان دەست لەملانێ و
بۆ منیش تەژی تەنیایی و
خەماوی بوو
لە سوچێکی مەیخانەیەک دانیشتبووم
نیگای هەستم
پژابووە سەر
لەنجەو لاری نازدارەکان
سەری مەستم
مەست تر ببوو
بە بینینی تێک ئاڵانی دڵدارەکان!
گوتی ناوم لۆجانایە
کەنداویم و
پێخۆشحاڵم ببمە هاورێت
بەم بۆنەیە، با شەرابێ نۆش بکەین و
بۆ چەند ساتێک
باڵامان لە یەک بئاڵێت
- ئاهـ لۆجانا
کامەرانم بە بینینت
شادومانم بە ناسینت
ئەو کڵاوە
چەند دڵگیرە بە سەرتەوە

ئەو جلانە
چەند ناسکن بە بەرتەوە
چاوەکانت
چ چاوێکی سیحر بەخشن
قژی ڕەشت
چ شەوێکی پڕ ئیلهام و شیعر بەخشن
لۆجانای گوڵ
تۆ شۆخێکی
زۆر بە سۆزو هێمن دیاری
دیارە وەک من
دەربەدەر و
ئاوارەی دەستی ڕۆژگاری
پەسەندم کرد ببمە هاودەم، ببمە هاوڕێت
چونکە چاوە جوانەکانت
لە چاوانی
یاری پێشووترم دەچێت!.

سوریا- دیمەشق
22.4.2000

# بێ ئارامیی

ئەو بێ دەنگی و بێ مەیلیەت
گەورەترین خۆشەویستی و
درێژترین گفتوگۆیە
بەڵام چیبکەم، ئەو دڵەی من
منداڵێکی
بێ عەجمان و سەرەڕۆیە
ئۆقرە ناگرێ
تا ئەو کاتەی
دڵی خۆتم پێ دەسپێری
بە شمشاڵی، سەبایەکی بەهاریانە
وەڵامێکی
دڵخۆشکەرم بۆ دەنێری!..

سوریا- دیمەشق
30.4.2000

## هەستێک

دەوروبەرت هەمووی منم
دەرگا، دیوار، پێخەف، سوراو
گوڵەکانی نێو باخچەکەت
تیشکی هەتاو
کە پێت دەخەیە سەر زەوی
من ئەو خاکەم لەژێر پێتا
یان کە شەوان
لەگەڵ یادی من دەخەوی
من لاشەیەکی نادیارم، لەنێو جێتا
ڕێبوارێکم
هەنگاو هەنگاو وام لەگەڵت
درەختێکی پیرەساڵم
ڕەگ و ڕیشەم داکوتاوە لەنێو دڵت
گوڵخەندەران
من ناتوانم
زیاتر بێژم بۆ نزیکیت
ئەم هاوکێشە، بەهیچ کەس ناکرێ شرۆڤە
ئایا لەدڵ بەملاوەتر
کام جێ نزیکی مرۆڤە؟!.

سوریا- دیمەشق
30.4.2000

## پەیامێك بۆ بەرد

هەروەکو چۆن
شاعیر ڕاهاتووی گریانە
شەڕ ڕاهاتووی
چیاکانی کوردستانە
وەک چۆن ماسی
لە خواردنەوەی ئاوی دەریا، نابێتەوە
دەرگای ڕەشی گرتووخانە
بەبێ هێزی و
بێ یەک ڕیزی ناکرێتەوە
وەکو چۆن چاو
لە تەماشای نازدار حەیرانان تێر نابێ
وەک چۆن گوێچکە کاسەکانم
بێ لای لایەی دەنگی ماملێ و
بێ ئاوازی بلوێر نابێ
وەک چۆن دڵی دایکی شەهید
هەموو کاتێک
نوقمی گریان و خەیاڵە
منیش، لەیاد کردنی تۆ
لەلام شتێکی مەحاڵە
تۆش ئازادبە
هەر چۆن تێم دەگەی، تێم بگە

بە دڵی خۆت
یاری لەگەڵ ژێیەکانی هەستم بکە
گرنگ ئەوەیە، ڕۆژ بە ڕۆژ
حەزم بۆتۆ زیاتر دەبێ، خۆشم دەوێی
ئەی ئەو پەیامە پیرۆزەی
هەر نەگەیی، هەروا لە ڕێی..

سوریا- دیمەشق
1.5.2000

# تکا

قەسەم بەتۆ
بە چاوی تۆ
بە گەورەیی و بەناوی تۆ
سوێند بە دوێنێ و
بە ڕابردو و بە ئێستامان
بەو پەیمانەی لە شەوێکی باراناوی
لەجێی ژووانذا بەستامان
سوێند بەو شەقامە چۆڵانەی
یەکەم دیدار
بەسەریاندا گوزەرمان کرد
بەو کۆنسێرتە پیرۆزانەی
لە فیستڤاڵی تێک ئالان، ئەزبەرمان کرد
قەسەم بەو وشە ناسکانەی
بە عەشقەوە
لە دەمی تۆ دەهاتنەدەر
سوێند بەو چرکە ئەفسوناویەی
کە گوڵ دەپژێ کاتی سەحەر
سوێندم بەو جوانە بێناوەی*
کە، گۆران ناوی نەهێنا
سوێندم بەو ساڵە نادیارەی
کە، نالی چاوی هەڵێنا
هەرچەند بڕۆم

**هەرچەند زیاتر دووركەومەوە**
**دەبیە باران**
**دەڕژێیتە سەر**
**چەتری ئیلهامی شەومەوە**
**بۆیە دڵێ، تکام وایە**
**ئەو بەڵێنەی**
**لە نێوانی ئێمە دایە**
**مەیشکێنە**
**مەیسوتێنە**
**هەستی شاعیر، سوورە گوڵێکی ناسکە**
**مەیوەرێنە**
**مەیژاکێنە!...**

* ئاماژەیە بۆ هۆنراوەی(جوانی بێ ناو)ی گۆران.

**سوریا- دیمەشق**
**8.5.2000**

## تێچوون

زەمین پڕبووە لە تاوان
ئاسۆ ڕووناکی نابەخشێ
لەنێو گلێنەی هەتاوان
جیهان بۆتە
گوندێکی پڕ لە ئاژاوە
خۆشەویستی پەرێشانە و، حاڵی شڕە
نەشتەرگەری بۆ کراوە
بڵندگۆکان
وەهم و ڕقیان لێ دەبارێ
ساڵمان، ساڵێکی نەهاتە و
لە جێی باران
خوێنێکی خەست دێتە خوارێ
وەفاو پاکی
باجیان لەسەر داندراوە
تیرۆرستێک، سۆزو ڕەوشتی لێ کوشتووین
کەس نازانێ
کێیە، چۆنە، نەناسراوە
دڵەکان زۆر ڕەق دەنوێنن
پاساریەکان
ئاوازی تێچوون دەخوێنن
دوگمەی ڕادیۆکەم بادەدەم
بە نیازی دەنگی سەنتووری، ئاوازێ

بۆلای سەرو خواری دەبەم
بێژەرێکی بەکرێگیراو
دەڵێ گوایە
لە زۆربەی جێ شەڕو کێشە
لە درێژەو گەرمی دایە
کە دێمە دەر لەماڵەوە
هەنگاو دەنێم بەسەر دڵی خیاباندا
سەیردەکەم دەوروبەرم
هەمووی ئاشنان
لەگەڵ بۆنی زبڵداندا
ئەو خاکەی کە
دێین و دەچین بەسەریەوە
بەڕەڵڵایە و، بێ سەردارە
ئەوەی مافیا و، بێ ویژدان و، چەقۆکێش بێ
ئەو لێزان و پایەدارە!
گوناهەکە لە خۆمانە
با شۆڕشێ بەرپا بکەین
قەڵای ترس و بێ دەنگیمان بڕوخێنێ
لەشکری سستی و بێ هێزی
لە دەقەری
شاری دڵمان تێک بشکێنێ
بەڵێ تاوان لەخۆمانە
با هەموومان، ڕێپێوانێ ئەنجام بدەین
لەگەڵ خودا
بوێرانە، وتوێژ بکەین
بڵێین هاتووین

ئەگەر ئەم دۆخە ناگۆڕی
ئێمە ئامادەین بتگۆڕین
چیت پێ دەکرێ؟
تۆ تەنیای و، ئێمە زۆرین!!..

سوریا- دیمەشق
10.5.2000

# مامۆستای وانەیەکی بێ ئەنجام

کەمتەرخەم بووی، ئەی مامۆستا
ئەی ئەو کەسەی
قافڵەی عەشقت لە وێستگەمدا ڕانەوەستا
بەقەد هاژەی
چەمی شیعر تامەزرۆت بووم
بۆ ئەڤینت، هەمیشە هەر لە زۆربوون بوو
بارانی حەزو ئارەزووم
بێ دەربەستی
خۆشم ویستی
زیاتر لەوەی هۆشم ویستی
ڕەشەبا و تۆفی ئەڤینت
دەرگای دڵمی بۆت کردەوە
خۆت لەمن کردە خانەخوێ و
جێگات لە ناخم کردەوە!
منی چەندجار
دڵشکاو و جەرگ بڕاو
منی بێ هاوخەم، بەجێماو
چاوەڕێ بووم
ببیە هێز و
لەم ڕووخانەم هەڵسێنیەوە
گوتم ڕۆژێ دێیتە لام و

لە باوەشت
گڕی دڵم دەکوژێنیەوە!
کەچی ئەتۆش، هەموو هەڵوێستت ئەوەبوو
بۆت نووسی بووم
من خۆشەویستی ناناسم
دڵم جێگای عەشق نیە
گۆڕەپانی چۆڵی هەستم
جێی مانۆڕو مەشق نیە!.

سوریا- دیمەشق
14.5.2000

# زمانی عەشق

لە زمانی
دەربڕینی هەستت ناگەم
لە خوێندنەوەی
پەڕەکانی
قوتابخانەی دەستت ناگەم
کە جارجار دێیتە باوەشم
پڕ بەحەزت
خۆت لە باڵام دەئاڵێنی
بە هێمنی
ڕازو نهێنی و کردەوەت
بەبن گوێمدا دەچرپێنی
چەند حەزدەکەم تێت بگەم و
بزانم چیە مەبەستت
لێت بپرسم
بۆ کێیە وا لەسووتانە
دڵی چەندجار ماران گەستت؟
بەڵام ئەسەف
بەرامبەرت
نایەمە گۆ، بێ زمانم
نە من دەزانم چی دەڵێی
نە تۆش هەستت دەجوڵێنێ
مانا و چەمکی شیعرەکانم

نە بەرماڵی کڵێسای سوجدە بردنمان
تۆزقاڵێکیش لەیەک دەچێ
نە دەزانین
کەشتی وێڵی نیگاکانمان، بۆ کوێ دەچێ!
بەو حاڵەوەش دڵ و سۆزمان
بەرامبەر یەک ئاسودەیە
چونکە عەشق
یەک زمان و
دەربڕین و مانای هەیە!..

سوریا- دیمەشق
15.5.2000

## له باڵكۆنی گەشبینیەوە

هەر مرۆڤێک، ڕەش نەبینێ
دڵی جارێک نەسووتابێ
لەناو بڵێسەی ئەڤینێ
هەر مرۆڤێک، ڕەگی هەستی
لەنێو ناخی
تراژیدیاکان نەڕوابێ
یان بۆ ساتێک
لەگەڵ کێشەی نەتەوایەتی، نەژیابێ
مرۆڤێکی سەرشێواوە
لە ڕووی پێکهاتەی ڕەوشتدا
ناتەواوە!
بەڵێ هاوڕێم، سێدارەو پەت
لە مرۆڤ، زۆر نزم ترن
کوانوویەکی
بێ گەرمی و گڕو ئاگرن
تۆش ئەمێستا
بیر لە دوێنێ مەکەرەوە
لەگەڵ تەوژمی غەمەکان
قەت ئاوێتە مەبەرەوە
تافی بەهاری گەنجیمان
هەڵەیەک بوو، ئێستا باجی دەدەینەوە
ڕۆژێک هەر دێ
ئەم گرەوە، ببەینەوە
وەرە هەردووکمان پێکەوە
پف لەچرای نائومێدی و ڕەشبینی کەین

بەرگی کۆنی بێ هیوایی
داکەنێنین و فڕێدەین
کێشەی ئێمە
گەورەترە
لە گریان و دەستەوەستان
بێشەی ئێمە
خاپوورترە
لە کەلاوەی بێ دەربەستان
ئێمە خەڵکی وڵاتێکین
زەردەی خۆرمان
هەرگیز تێیدا نەبینیوە
گوڵی زۆرمان
لە باغەکانیا، نەچنیوە
وەرە نەخشەیەک دابنێین
بچین ملی جەللادەکان بقرتێنین
لەجێی دڕک
گوڵی زەردو سوور بچێنین
ها، ئەوە پاچ
ئەوە هێزو پاڵپشتی ماچ
با مرۆڤ بین
پەرستگاکان بڕوخێنین
لەوە زیاتر
هەست وهۆشمان نەخافڵێنین!..

سوریا- دیمەشق
18.5.2000

## سترانی لێك ترازان

دایە دایە
ئەمشەو هەستم
لە خانەقای زیکرت دایە
هەرچەند دەکەم بێ لای لایە
خەوم نایە
شەو تۆفان و ڕەشەبایە
شەوێکی تووش و یەڵدایە
دەوروبەرم
ئاهەنگ و سەماو هەرایە
ژووری منیش تاریک و سارد، بێ چرایە
دایە دایە
لە دووری تۆ و
باوەش و خەوی سەر ڕانت
رۆحم لە گیانەڵا دایە
دووربێ لەتۆ
دڵم بە ئازارێک دێشێ
دڵنیامە، کەوا مردنی لەدوایە
دایە دایە
ئەمشەو لانەم
وێرانێکی بێ دەرگایە
فرمێسکی چاو، وەک دەریایە
دوایی نایە
پڕ بەدەنگم هاوار دەکەم

دەنگ بێ ئاوازو سەدایە
هەر بەوێنەی دەنگی مردوو، بێ مەودایە
لەو ڕۆژەوەی
بە ئاهو ناڵەم سپاردی
ژیان و مانم، عوقبایە
هەرەس هێنان و شکستە، ئەم سەودایە
دایە دایە
ئێستا ڕۆڵەت
دەربەدەر و بێ جێگایە
دڵشکاو و
بە ژان و دەرد و بەڵایە
بێکەس و ماڵ و ئەنوایە
دایە دایە
چەندە سەیرە ئەم دونیایە
چەند بێ وەفاو، بێ بەقایە
بۆخەڵک خۆشی و ئارامیی
بۆمن و تۆش، لێک ترازان و مەنفایە
دایە دایە
هەرچی بڵێم و بنووسم
لە بەرامبەر گەورەیی تۆ، بێ بەهایە
لێم ببورەو پەشیمانم
نەدەبوایە
ئەتۆم بەجێ بهێشتایە..

سوریا- دیمەشق
**20.5.2000**

# ئیرەیی

خۆشم ویستی
چونکە لەمنی دەربەدەر، گوناهتر بووی
کاتێ کە سەیرم دەکردی
لە منی وێڵ
دڵ بەژان و پڕئاهتر بووی
لە شەوێکدا، ئاوێزانی یەکتری بووین
چواردەورمان
هەمووی ڕق و ئیرەیی بوو
دەوروبەرمان
کێڵگەی بوغزو توڕەیی بوو
پاسەوانە کوێرەکانیش
بەرامبەری عەشقی ئێمە، لە کەمین بوون
هەموو کاتێک
خەریکی خامۆش کردن و
داپڵۆسین بوون
ئەوان ئاوا فێرکرابوون
عەشق حەرام و تاوانە
سزاکەشی
لەداردان و گیان کێشانە
بۆیە کاتێ
دڵنیا بوون
من و تۆ، یەک دڵ و گیانین
کە زانیان، ماڵی عەشقمان یەک ماڵە و
ئیتر بەبێ یەک ناتوانین

یاسای ڕەشی شاربەدەریان
بەرامبەرمان بەکارهێنا
ڕەگ و ڕیشەی ئەم حەزەیان
لە بنچینەو شادەمارەوە دەرهێنا!
بە ڕۆژی ڕوون
دەرگای دڵیان شکاندین و
ماڵی حەزیان تاڵان کردین
چاوەکانیان
پڕ لە کوڵی گریان کردین
من تا دەمرم
ئەسیری ئەو فرمێسکانەم
کە دوا دیدار بۆت ڕژاندم
یان ئەو خەندە پڕ مانایەی
لە نێوانی دوو لێوانت بۆت تاساندم
ماڵئاوا گوڵم ماڵئاوا
ئەم سەدەیە
سەدەی خامۆش بوونی عەشقە
سەدەی ئەڤین لەناوچوونە
سەدەی وەفا بزر بوونە
چاک دەمزانی
لە نێو پیسی و
بوختان خانەی ئەم سەدەیە
خەباتی خۆشەویستیمان
هەرەس دێنێ و بێهوودەیە!..

سوریا- دیمەشق
4.6.2000

# زیکری وڵات

چەند گوناهـ بووم
ئەو کاتانەی
بەدەم ئەشک و هەناسەی سارد
دوارۆژم دایە دەست ڕێگا و
وڵاتیشم
بە غوربەت و مەنفا سپارد
چەند دڵتەنگ بووم
کاتێ جانتام کردە کۆڵ و
بە تەنیایی، ڕێگای مردنم گرتەبەر
لە ئاگردانی سۆزمدا
گوڕگوڕ پشکۆی
ڕقی شیعر، دەهاتەدەر
من مۆمێک بووم
بە ڕەشەبای زوڵم و ستەم، کوژامەوە
گوڵێک بووم و
لە ڕەگەوە هەڵیانکەندم
بۆیە ئیتر، نەژیامەوە
وایانزانی ئەگەر بڕۆم
چرای هەڵوێست، لەماڵی دڵ، خامۆش دەبێ
لە کوردستان دوورکەومەوە
هەستی پاکی نەتەوەییم، بێ هۆش دەبێ
بەڵام هەیهۆ

ئەوان یەکجار خەیاڵ خاو بوون
لە ئاست مندا
کوێرو نابینا و بێ چاو بوون
نەیانزانی کە ڕۆیشتم
کوردستانم
لەناو چاوم حەشاردابوو
گوندو کانی و باخچەکانیم
لەنێو ناخی
جانتاکەی پشتم دانابوو
بۆیە ئێستا
بەیانیان کە هەڵدەستم
یان لەکاتی ئارام بوونی
لافاوی شیعرو هەڵبەستم
لە گوڵزاری هەستی پەرتم
لەناو گیانی
شەکەت و ماندوو و کەرت کەرتم
لە نوستن و ڕابوونمدا
لەناو کەشی
ساتەکانی هەڵچوونمدا
لەگەڵ خۆمدا
لەسەردێری گفتوگۆمدا
لەگەڵ خشپەی هەنگاوەکان
لە بینینی
چاوە ئەشک تێزاوەکان
هەتا لەنێو ژووانیشدا
لەگەڵ قاقای پێکەنین و، گریانیشدا

کوردستانم هەر لەگەڵە
بۆ ڕووناکی وەرزی پەستیم
ئاسۆی زێرینی دەم کەلە
بۆیە کوردستانی شیرین
کوردستانی
لێواولێوی غەم و برین
ڕاستە ئێستا، لەتۆ دوورم
لەنێو کوانووی پشکۆی سوورم
بەڵام هەرگیز
تۆی میهرەبان لە من دوورنی
لەگەڵ مندا
بە تەلبەند و، بە سنوورنی
تۆ ئەوەتا، لە دڵمدای
جادوویەکی، لە ملمدای
من و تۆ وەک پووش و ئاگر
قەت لە یەکتر ناکرێینەوە
ئاوازێکی ئەبەدین و
تا دونیایە، نابڕێینەوە!..

کوردستان-حەسەکە
29.6.2000

## گەڕان بە شۆستەکانی نائومێدی دا

دڵدارێکی کۆڵنەدەر بووم
تا بۆم کرا، بە نێو ناخت شۆڕ بوومەوە
دەرگای دڵت بە ئاسانی
ئاوەڵڵا بوو بە ڕوومەوە
پیاسەیەکی زۆر ناسکم
بە شەقامی، هەست و سۆزو دەروونت کرد
فڕینێکی زۆر سەرکەوتووم
بە ئاسمان و
قاڕەکانی گەردوونت کرد
پڕ بە حەزم
چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بووم
دوگمەی سینەت بترازێنم
بە ڕادەیەک ئاوێتەت بم
هەموو بازگەو سنوورەکان ببەزێنم
لاشەی تەژی لە ئەڤینم
بە گڕ سووتاند لەبەر دەمت
گوتم هانێ رۆحی ڕەوان
بەقوربانی تاڵە قژێکی پەرچەمت
بە دەیان جار پێم دەگوتی
هۆ ناسکە کچ
قەزات لە ماڵم بکەوێ
نزام دەکرد پێش تۆ بمرم
جا لێرەبێ، یاخود لەوێ
خوا بتگرێ

که دەتزانی بۆمن نابی
بۆ ڕێگەتدا ببمە هاوڕۆح و هاوسۆزت
ببمە گیان فیداو جەنگاوەر
لە شۆڕشی
پڕ هەرەس و نا پیرۆزت
لێت نابوورم
چونکە کەتۆ بەجێت هێشتم
یادەکان هەتیو مانەوە
گڵۆپی سەر
شۆستەکانی ئاسودەییم، کوژانەوە
هەر پێش ئەوەی
تۆ تەفرەم دەی
من و عەشق دەستگیران بووین
هەموو کاتێک
دەم لەناو دەم، لە ژووان بووین
بەڵام حەیف
لە پێناوی هەڵەی گەورەی, خۆش ویستنت
عەشق نەفرەتی لێ کردم
عەشق لەعنەتی لێ کردم
عەشق ئێوارەی پایزێ
جێی هێشتم و، لەگەڵ خۆیدا ڕووناکی برد
چونکە بەرامبەر یاساکەی
ناماقووڵی و نامەردیم کرد..

سوریا- دیمەشق
30.6.2000

## خۆشەویستی و شتی تر

ئازیز پیاسەکان لەگەڵ تۆ
گەورەبوون و خۆشبینی و ئەڤین دەبەخشن
مانای پاکی و
بەزم و هەڵپەڕین دەبەخشن
بەهار جوانی تۆی لێ دەتکێ
بۆیە بەتۆی دەشوبهێنم
کە ئەتۆ بوویتە گوڵی من
ئیتر سەیری گوڵ ناکەم و
وەک ئەهریمەن، هەر هەموویان دەوەرێنم
من ئامادەم، وەکو فەرهاد
لە پێناوی گەیشتنم بە چاوانت
بێستوون پڕ بکەم لە نیگار
بە نیازم
بەیاننامەی ڕێککەوتنمان
پەخش بکەم، لە چەقی شار
بە نیازم زۆرشت بکەم
گەر قەبوڵکەی
نەک مزگەوت و کڵێساکان
نەک لووتکەی بەرزی چیاکان
بەڵکو دەچم
هەرحەوت ئاسمانیش، دەڕمێنم
چڵکاوخۆرو پاسەوان و پەریەکانیش

لەگەڵ خودا دەخنكێنم
ئەوسا گوڵێ، تۆ ببە خوام
ببە شیعرم، ببە بڕوام
ببە دیكتاتۆر بە سەرم
ئەنفالم كە
وێرانم كە
ئەسیری دەستی ڕۆژگار و
دیلی كوڵبەی ئەحزانم كە
من ئێستاكە، خۆم لێ وونە
خۆت ناونیشان و ناوم بە
گەر دەخوازی
ها ئەوەتام، لە ناوم بە...

كوردستان- قامیشلۆ
20.9.2000

# لاوکێکی یاخی بۆ دایکم

وای لێ دایێ، وای لێ دایێ
لەخۆم بێکەس وغەریب و کەس نەمایێ
ئێستا بۆتۆ پەرۆشترم
لە زارۆکێک
لە مەمکی دایک بڕایێ
وای لێ دایێ
لە چاوەڕوانی، چاو کز بووم
پەرێشانم
بۆچی دەنگ و هەواڵ نایێ؟
با نامەت بێ و
دەربازمکا، لە ئازارو گیانەڵایێ
کچێ دایێ
ئەوەندەم غەم لە دووریت خوارد
غەم لەسەر دڵم زۆر بووە
بەقەد قورسایی چیایێ
وای لێ دایێ، وای لێ دایێ
لەمن و لەتۆ گریاو و لێک دابڕایێ
لەمن و لەتۆ هەناسە سارد
زۆر لێکرایێ
چۆن لەیادکەم، توخوا دایێ
ئەو کاتانەی
وێڵ بووین بەدوای مەنزڵگایێ؟

ئەمان دەتوانی بسرەوین
لەژێر دیواری، پەنایێ!
ئەو سەردەمەی، سێ ڕۆژ جارێک تیکەنانێ
سالێ جاری
دانیشتن لەبەر چرایێ
بیرتە دایێ
کوێرەوەری و دەربەدەری
بەشێ مە بوو لە دونیایێ*؟
هەوڵماندا، تێمانکۆشی
هەوڵ و ڕەنجمان
وەک خەرمان بوو لەبەر بایێ
هەنگاومان نا، بۆ گەیشتن بە هیواکان
هەنگاوەکان، بۆ پاشەوە
بڕستی خۆیان دەدایێ
وای لێ دایێ، وای لێ دایێ
کە منداڵ بووم دەتگوت ڕۆڵە
نیشتمانی خۆت خۆشبوێ
بە هەموو هێزو توانایێ
بەڵام دایێ
پاش هەوڵ و ڕەنج و تێکۆشان
ئێستا وڵات منی ناوێ
وەفاو پاداشتی نیشتمان، هەرئەوەبوو
دەریکردم
لەناو وەرزێکی سەرمایێ
وێڵی کردمە
پێدەشت و چیاو سەحرایێ

بەڵێ دایێ
دوژمن دەهات نیشتمانی وێران دەکرد
ئەویش پڕی دەدا ئێمەی
دڵسوتاو و لێقەومایێ
ئێمەی دووژمن باوک کوشتە و
بە خۆشمان لەمێژ کوژرایێ
ئەرێ دایێ
خۆری زۆربەی خەڵک هەڵات
دەپێم بڵێ
بۆ خۆری ئێمەش هەڵنایێ؟
بۆ ڕۆژی ئێمەش دانایێ؟
وای لێ دایێ، وای لێ دایێ، وای لێ دایێ
چیت بۆبڵێم
لەوێ دونیای بێ وەفایێ؟
باسی مەرگی لەمێژینەم
یان مردنی شەوانەم، لەسەر چارپایێ!
دە، دەی دایێ
پاڕانەوەیەک، نزایێ
بەڵکو ڕزگاربم لە داوی
هەرەس و جەفاو بەڵایێ
وای لێ دایێ، وای لێ دایێ، وای لێ دایێ..

*- بەشێ مە بوو، بەشی ئێمە بوو.

سوریا- دیمەشق
27.12.2000

## شنەی ئاهێك لە جەژندا

با خەڵک هەر، خۆشبەحاڵ بن
وێڵی جەژنەو،ماڵەوماڵ بن
با باغەکان جوان بنوێنن
با کچە پەری ئاساکان
بە نیگای چاو
دڵی لاوان بلاوێنن
با منداڵان، هەرهۆگری کامەرانی و
بەزم و پارەو فیکەفیک بن
با لێوەکان
بە گفتوگۆو
بە ماچی جەژن خەریک بن
با دڵداران لە هەواڵی یەک بپرسن
بەیەک بڵێن ئەرێ چۆنی؟
با گوڵەکان لەبەربکەن بەرگی تازەو
بگۆڕێنن سیمای کۆنیی
لەچاوی من
ئێرە هەمووی
کاوڵ و چۆڵ و وێرانە
کە غەریب بم
کە نەتوانم، بچمە ماڵێک بۆ جەژنانە!
دوور لە یار و نیشتمان و کەسی دڵسۆز
بە کێ بڵێم جەژنت پیرۆز؟
کێ پێم بڵێ جەژنت پیرۆز؟..

سوریا- دیمەشق
28.12.2000

# تۆ نەتتوانی لەمن بگەی

چۆن بتوانم
لە یادی خۆمت بەرمەوە
کە عەشقت تۆف و باران بێت
هەموو کاتێک، داببارێ بەسەرمەوە
عەشقت بۆمن نیشتمان بوو
ستران بوو، گوڵ بوو، گریان بوو
عەشقت هەناسە و پاکی بوو
بۆ هەردووکمان ڕووناکی بوو
عەشقت هێشتا مەزنتربوو
لە ئەڤینی زین و مەمێ
ئێمەش گیانە
چاونەترس و جەسوورتر بووین
لەو عاشقانەی، ناویان نووسیون سەردەمێ
ئا، روحا من عەشقت جوان بوو
فێنکی وەرزی بەهارو
کڕێوەو زوقمی زستان بوو
لە ئەڤینداریی نێوانمان
سەرەڕای جارجار تووڕەبوون
بێجگە لە غەیدین و هەڵچوون
زۆر شتیشمان، هێشتا لە گوڵ ڕەنگین تر بوون
چرپەکانی جێی ژووانمان

لە هەنگوین زۆر شیرین تر بوون
هەقدیتن لجەم بەکداش و*
توانەوە لە باوەشی یەکتریدا
چەند جوان بوون گوڵێ، چەند جوان بوون
گوڵفرۆش و
دەستگێڕی نێو باخچەکانیش
لە خەیاڵی بۆیەک بوونمان بێگومان بوون
هەموو کاتێک
کێشەمان بوو لەسەر ئەوەی
کاممان پێشتر، قوربانی چاوی کاممان بین
یان ئەوەتا
کاممان زووتر
بۆ ئەوەیتر بە حەیران بین
تۆ دەتگوت من رۆحم ناوێ
با سەرگەردانی باڵات بێ
منیش دەمگوت، نا گوڵی جوان
من حەزدەکەم
دڵ و گیان بۆتۆ خەڵات بێ
بەڵام حەیف
خۆشەویستی و، لێک حاڵی بوونی نێوانمان
دووشتی زۆر لێک جیا بوون
جووتێ کەوی بەندکراوی
بێ ئاسمان و بێ چیا بوون
لەگەڵتدا
هەنگاوم نا, زۆر بە ووردی
نەک هەر شیعرو پەیڤەکانم

ژیانیشم فیدا کردی
کەچی دوای هەموو هەوڵەکان
پشتی هەموو، کاتە ناسک و گەورەکان
تۆ نەتتوانی لەمن بگەی
تۆ نەتتوانی لەمن بگەی
تۆ نەتزانی لە پێناوی خۆشەویستی
دەبێ چەمکی گۆڕانکاری
لەگەڵ خۆتدا تاوتوێ بکەی
ئاخر گوڵم
لەم غەریبیە چیم شک دەبرد
لە وەفاو عەشقت بترازێ؟
بۆچی هێشتت، لە عەشقتدا بتوێمەوە
کە دەتزانی
زەماوەندی بۆ یەکتر بوون
هەرگیز بۆ ئێمە ناسازێ؟!..

*بەگداش: ناوی یەکێک لە ساردەمەنی و گازینۆ هەرە بەناوبانگەکانی دیمەشقە، دەکەوێتە بازاڕی حەمیدیە لەو شارە..

سوریا- دیمەشق
8.9.2001

# زەڵـــکـــاو

ڕاستە ئێستا
دووری وڵات ئازارێکە و
سەرتاپای گیانی تەنیوم
یان بێ کەسی، بۆتە پرسە
تارای ڕەشی پێ پۆشیوم
ڕاستە زۆرجار
کۆچی سووری ئازیزانم
کزم دەکا لە تەنیایی
دەمباتەوە نێو باوەشی
کوڵ و ناڵین و جودایی
ڕاستە ئێستا
خەریکم خۆم
لە قومارخانەی سەفەردا، دەدۆڕێنم
دڵنیامە بە ئاسانیش
ناتوانم خۆم
لەم زەڵکاوەدا دەربێنم
بەڵام ئێستاش
من تاکێکم لەو چەند کەسەی
لە شەوێکی تاریکاوی و
ئەنگوستە چاوی هەولێردا
لە شوێنێکی، مەرگ ئامێزو هەڵدێردا

بە ئەوپەڕی باوەڕەوە
بە گیانێکی
زۆر لەهیوا بەسەرەوە
هەر هەمووومان
یەک دەنگ گوتمان
با بڕوامان بە ئایندەی خۆمان هەبێ
با ژێیەکانی هەستمان
دەنگی ژیانی لێوەبێ
هەمووومان کۆک و، یەک دەنگ بووین
ژیان دەبێ سەرهەڵدان بێ
تێکۆشان بێ
لەپێناو نوێ بوونەوە
بۆ گەیشتن بە ئاوات و
ترۆپکی ئاسۆی ڕوونەوە!..

سوریا- دیمەشق
25.9.2001

# پەشیمانی

ناخم پڕە لە یادی تۆ
یادێکی شێت
شیعرم دەکەم بە حەیرانی
ژانی بێ جێت
هەولێر، ئەمشەو سوێندت دەدەم
بە ماهتابی ئاسمانی شار
بۆچی غەمت ڕشتە پیاڵەی
شەوی دووری و تەنیایی یار؟
هاتووم سوێندت دەم بە قەڵا
بەو دەستەسڕە دڕاوەی
لەدوای گریانی دایکمدا، بووە ئاڵا
چۆن دڵت هات
نامەی لاویم لێ بدڕێنی؟
بە خەردەلی شەڕی دۆڕاوی هەندەران
وەک هەڵەبجە بمخنکێنی؟
هەولێر ئێستێ
لەناو دەریای
ڕق و هەڵچوون وتوڕەییم
ئەسیری دەستی شورەییم
هەست دەکەم با
نەغمەی مەرگم بۆ دەهێنێ

چەتەی بێ شەرمی زەمانە
وا خەریکە، هەرچیم ماوە لێم دەستێنێ
جاران هەرتەنیا ئەتۆ بووی
ئەگەر خۆم لەخۆم ون ببام
دەتگوت هانێ ئەوە ڕووبار
هەموو شتێکت پێ گوتم
ڕەوشت، هەڵوێست، ئەڤینی یار
تەنیا، هەولێر
کە سەرم هەڵگرت ڕۆیشتم
کە گوتم ئیتر دەڕۆم و
منیش سەوداسەری گەشتم
وەکو ئەرکی هەڤاڵیەتی و
وەک ڕێنمایی
بۆچی نەتگوت سەفەرمەکە و؟
ئەستەمە دووری وجودایی!
هەولێر بێزارم لەخۆم و
بەم فیراقە دڵگرانم
ئەم مەنفایە وێرانەیە و
منیش تێیدا سەرگەردانم!..

سوریا- دیمەشق
1.1.2002

# کۆڵنەدان

لەوەتەی دونیا، دونیایە
لەو ساتەوەی
مانگ و زەوی، جێ گۆڕکێیان بێ کۆتایە
لەو ڕۆژەوەی لێوی عومرم
لەسەر پێکی ژیاندایە
هەر زانیومە
لەدوای بڕانەوەی زستان
بەهار بارگەی لە ڕێگایە
پێیان گوتووم
دوای تەواو بوونی پەشێوی
هەر شایلۆغان و هەڵڵایە
هەموو پرسەو کارەساتێک
هەڵسانەوەو گەشبینی و خۆشی بەدوایە
گریمان ئەوەی نووسیمان
هەمووی ڕاستە، هەمووی وایە
ئەی باشە بۆ؟
منی نامۆ بەم شتانە
ساڵەهایە
مەلی حەزم
لەناو قەفەسێ تەنیایە
گوندی دڵم

تاریکستان، بیّ چرایه
سەرباری غەم و کێشەی خۆم
سەیر دەکەم، هێشتا وڵات بیّ ئاڵایە
ئەوەی تا دوێنیّ جەردە بوو
ئێستا گورگە
بەڵام لە پێستی مەڕ دایە
با وای لێبیّ ئەو دونیایەی
کە خۆی هەموو کات هەر وایە
لەم حالەتە
کۆڵنەدان لە ئاست ژیاندا
باشترین چارەو ڕێگایە!...

سوریا- دیمەشق
2.2.2002

## پوکانەوەی خۆزگەکان

ئەی گوڵپەری
لە دووری تۆ
چرۆی ئارامم هەڵوەری
کەچی جارێک
نەغمەی مەلی هەواڵێکت
بە ئاسمانی چاوەڕوانیم تێنەپەڕی
منی غەریب
منی بە مەنفا ناتەریب
منی هاودەمی غەمەکان
زادەی چیا ئەستەمەکان
منی هاوڕێ لەگەڵ سرووشت
منی نەوەی
هەڵسانەوەو، چەندین نشوست
ئەی گوڵپەری
من خاوەنی گەلێک شتم
خۆم سەرداری
لەشکری وەفاو ڕەوشتم
حەزەکانم توایەوە
هەر وەکو مۆم
توانیم ببمە هەموو شتێک
بەڵام هەرگیز نەبووم بەخۆم
ڕێگایەکی دوورم بڕی و
ڕەق هەڵاتم، لە زستانی سەختی خەبات
هەر نەبوومە خاوەنی تۆو
خاوەن وڵات!...

لبنان- بەیرووت
26.4.2002

# نەخشەی مەرگ

دەکرێ بێ هیچ پرس و ڕایەک
سەفەرکەیت و
سەری تەنیایی هەڵگری
دەشێ بێ من
لە مێزگردی عاشقاندا، بە توندڕەوی
سەرنج و ڕای خۆت دەربڕی
ڕێگات دەدەم
پێبکەنی، یاخود بگری
تۆ، قەیناکە
هەر شتێ دەکەی ئازادبە
بەڵام نەکەی بێ من بمری!..

لبنان- بەیرووت
28.4.2002

## غوربەت لەگەڵ تۆدا چ نیشتمانێك بوو؟

بەقەد گیرفانە دڕاو و
دڵە گەورەو زەنگینەکەت
بەقەد ماڵە چۆڵ و هۆڵ و
ژووره سارد و ڕەنگینەکەت
یادت دەکەم
یادی ئەو ڕۆژانەی مەرگ
هەر بستێ لێمان نزیک بوو
یادی ئەو عومرەی، هەژاری
هەر بەئێمەوە خەریک بوو
یادت دەکەم
برای ساڵانی غەریبیم
چرای شیعری ناتەریبیم
ئەو دەمانەم لەیاد ناچێ
برسی دەبووم
لە عەشقت تێرت دەکردم
لەگەڵ وەفاو گەورەیی خۆت ڕاتهێنام و
گەرتۆ نەبوای
هەر لەوێدا من دەمردم
یادت بەخێر
یادی شام و یادی یاران
یادی(شەوە ناخۆشەکە)و
یادی جاران

**تۆ ڕۆیشتی و، لەدوای خۆتدا**
**هەر یادەکانت مانەوە**
**هەی هەی، لەو یادە گەورانەی**
**بە هیچ شتێک نەتوانەوە**
**ئەریَ هاوڕێم**
**لە یادتە، شەوی لە یەکتر دابڕان**
**چ شەوێکی پڕ لەسام بوو؟**
**ئەو سترانەی گویَ بیستی بووین**
**چ نەغمەیەکی پڕتام بوو**
**(هۆ خەجیَ گیان***
**وامەزانە کە دوورم لێت**
**گویَ ڕاگرە، ئەوا نێرگز**
**گۆرانی عەشقت بۆ دەڵێت**
**وامەزانە کە لێت دوورم**
**ئەمن ئێستا**
**گڵپەی دڵی هەڵۆی سوورم)!..**

ئاماژەیە بۆ گۆرانیەکی، حەمە ڕەئووف کەرکوکی..

ئێران- تاران
**20.7.2002**

# چرۆی یادێکی هەڵوەریو

هەرلێرە، لەم(ئێران)ە بوو
لەم وڵاتە
پڕ ئاخوند و، وێرانە بوو
ساڵانێکی دوور لە ئێستا
کچێک دڵی بۆم کردەوە و
نسێی حەزم
لە هەیوانی دڵی وەستا
ئەمڕۆ هاتووم یادی بکەم
یادی شتە جوانەکانی
یادی ماچ و
ڕاموسان و جێی ژووانی
یادی جەنگ و ئاوارەیی
هی غەریبی و بێچارەیی
سەخت بوو ئەوەی بینیمان
مەرگ بوو ئەوەی چنیمان
لە شەشەمین
ساڵیادی لێک دابڕانمان
لە وەرزی بەبێ بارانمان
چەپکێک گوڵت بۆ دەنێرم
بە بەهارو
ماچ و پەپوولەت دەسپێرم
نازانم ئێستاش هەر کچیت؟

یاخود دایکی منداڵانی!
کێ دەڵێ منت بیرماوە؟
لەوانەیە، ئێستا ناویشم نەزانی!
ڕەنگە ڕۆژێک بتبینمەوە
پیری ڕوخساری تێک دابیت
ڕەنگە بڵێم من فلانم
لێم تووڕەبی و، بڵێی تۆ چیت؟
بە ڕاستیش ڕەنگە هەروابێ
نهێنیەکانی نێوانمان
دەشێ هیچت بیر نەمابێ!..

ئێران- تاران
**12.9.2002**

## نهێنیەکانی شام

تەمەنێ بەسەر سەفەرو
لێک دابڕانمان تێپەڕی
نەمن زانیم چیت بەسەرهات
نە تۆش ئیمێلێک، نامەیەک
بۆمنی خوای کوێرەوەری
خۆ لەبیرتە، چ ئازارێکمان دەبینی
بە دەست سۆفیەکانی بەعس و
شێرە کوێرەکانی ئەوێ؟
تەنانەت ئۆقرەبڕ ببووین
لە ڕازان و شیرین خەوێ
لەیادتە
چ حەسرەت و ماندووبوونێک، هەقاڵمان بوون
هەر برسیەتی و نائومێدی
تێکەڵاوی
تەمەن و مانگ و ساڵمان بوون
نە من، نە تۆ
نە ئەوانەی هاوشێوەمان
ڕۆژێک بە دڵخۆشی ناژیاین
بشنێتەوە، گەڵای خەندەی ئەو لێوەمان
گەر ئێمەش وەکو(کەسانێک)!
ئامادەبواین، بیرو باوەڕمان بفرۆشین
بمانویستبا
لەسەر مێزی ملهوڕەکان
پێکی خیانەت بنۆشین
هۆڵی بەزم و دیسکۆکانیان
بە ڕووماندا، دەکردەوە
بۆ حەسانەوەو جووتبوونیش

ئێمەیان بۆلای هاوسەر و
خوشکەکانیان، دەبردەوە!
بەڵام من وتۆ، بە توندی
ئەمانەمان بەلاوە نا
پێمان بەسەر
ئەم کردارە(بێزراو)ە نا*
ئامادە نەبووین خیانەت
لە دایکانی جگەر سووتاوی قامیشلۆ و
هەڤاڵانی عفرین بکەین
خەباتیان تووشی هەڵدێر و
لەناوچوون و بەزین بکەین
لەم یادەدا سڵاو لەتۆ
لە جەسووری و گیان فیدایی و قارەمانیت
لە هەڵوێست و
هەستی بەرزی نیشتمانیت
سڵاو بۆئەو ڕۆژەی کەوا
دوایین وەڵاممان بۆ ناردن
قاسیدمان پێ ڕاسپاردن
بۆمان نووسین، ئامادە نین
بیرو باوەڕمان بفرۆشین
نامانەوێ لە قەحپەخانەی ئێوەدا
پێکی خیانەت بنۆشین..

*- بێزراو: قێزەوەن، نەویستراو.

ئێران- تاران
**29.9.2002**

## کۆنەپەرست

لە بیرمە
یەکەم ژووان زۆر شتمان گوت
گوتمان ئەگەر زستان ڕۆیی و
ڕەشەبای پایز هەڵی کرد
یان زریانێ، سپینداری عەشقی ئێمەی
بۆ هەڵدێر و لە ناوچوون برد
ئەوسا ئێمە
بۆ مانەوەی چرۆی حەزمان
بۆ پاک بوونەوەی ڕووباری پڕ قەڵبەزمان
دیسان دێینەوە بە هەڵبەز
نەفرەت لە گومان دەکەین و
ڕووبارەکان پڕ دەکەینەوە لە قەڵبەز
هەر لەوێ بوو
دروودمان بۆ پاکی نارد و
نوێژی عەشقمان بۆ یەک کرد
بۆ بەرگری و هەڵایسانی هەر کێشەیەک
سەربازگەی دڵمان پڕ چەک کرد
چی ما، ئێمە باسی نەکەین؟
چی ما، ئێمە ناوی نەبەین؟
ڕێککەوتنمان دوایی هات و
تەنیاییمان، بە لەناوچوون سپاردەوە
کەچی هاتی و

بە سەرکێشی و لووت بەرزی خۆت
هەوڵەکانت بۆ پاشەوە گەڕاندەوە
چەند دڵڕەق و
لەخۆبایی و کەرزادە بووی
هەموو کاتێ
بۆ تێکدان و پیلانگێڕی ئامادە بووی
ئێستاش کاتێ یادت دەکەم
بە کەسێکی کامڵ نەبوو، لەخۆم دەگەم
تۆ تێکدەرو بێ ویژدان بووی
کۆنەپەرست و نەزان بووی
نە هێشتت من ئاسودە بم
نە ڕێگەتدا
بەدوای عەشقت ئاڵودە بم!..

کوردستان- سنە
9.10.2002

## ملهوڕ

من ڕازی نیم بەم ژیانە
ئەو ژیانەی
تەژی ناڕێکی و بوختانە
ئەم سەردەمە پڕ درۆیە
گەر لایەنگیری لێ نەکەی
ماڵی دڵت بێ ناسیاو و هاموشۆیە
ئێستا یاسای
بوون و مردنیش گۆڕاوە
ڕۆتینی جاران نەماوە
خەڵک ئێستا
بێ منداڵی گەورە دەبن
بێ گەورەیی
بۆ گوفەکی مەرگ دەچن
بێ مردنیش
تلیاکی غەم دەیانکوژێ
بەبێ تاوان
ڕەشەبای تۆڵە هەڵدەکا و
بەداخەوە خوێنیان دەڕژێ!
هۆ خەڵکینە، ڕەشەباکان
سەگ وەڕینی
ناو شارو گوندو چیاکان
شەرمەزاری ئاسۆی ئێوەن
ئەوان حەزناکەن خۆر هەڵبێ

چونکە دوژمنی کازێوەن
هۆ خەڵکینە
من دەزانم ساڵانێکە ئێوە مردوون
ئەفسوونی خێو و عەزیاکان
کولەکەی دڵی لێ بردوون
دەستەوەستان دامەنیشن
هەوڵدەن ئەفسوون بەتاڵکەن
ئەو هەرێمەیان لێ تاڵکەن
ئێوە ئازاو خۆنەویستن
ئێوە خاوەنی دیرۆکن
هەر خێوەکان ترسنۆکن
هەر ڕێویەکان چاوچنۆکن
بۆ خواردنی گۆشتی مەلێکی بێ تاوان
بە ملهوڕی لەسەر چۆکن..

ئێران- تاران
**15.10.2002**

# کەلاوەی ژیان

لەم دووڕیانی مەنفایەدا
بە تەنیایی و لێقەوماوی بەجێماوم
چەند پەرۆشی گەڕانەوەی
تیشکی زەردی خۆرەتاوم؟
لە وڵاتی خۆم غەریب و
ئێستاش غەریبتر لەجاران
بەزیاد نەبێ ئەو ژیانەی
دوور لە سەفاو نیگای یاران
ئەم سەراب و لێقەومانە
بووەچی هەر نەبڕایەوە؟
ئەودەرگایەی گوایە لە ڕووم دەکرێتەوە
کوانێ هەرگیز نەکرایەوە؟
بەجۆرێک خۆم ونکردوە
ئێستا نازانم کێم و چیم
بەدەم زریانی عومرەوە
هەزاران گەڵای شۆڕەبیم
جاران ئەگەر دڵگیر ببام
شیعرێک دڵی دەدامەوە
مەیلی تێک ئاڵانم هەبوا
ماڵیان ئاوا کچانی شام
دڵخۆشیش بوون، کە دەهاتن بەلامەوە
ئێستا شیعریش

**کچ و گوڵ و شتی تریش**
**ئەو نەشئەی جاران نابەخشن**
**هەر هەموویان**
**لەبەرچاوی هیوام ڕەشن**
**من دەزانم**
**لە ئەنجامدا**
**بە(تەور)ی غەم, خوێنم دەڕژێ**
**ئەی مەرگی پیرۆز تۆ لەکوێی**
**ژیان خەریکە دەمکوژێ*؟..**

*- هەژار موکریانی دەڵێ:
**ئەی مەرگ لە کوێی، ژیان کوشتمی.**

**ئێران- کەرەج**
**18.10.2002**

## لێبوردن

هاتی و گوتت پەشیمانم
گوتت بۆتۆ
دڵ وچاو، پڕ لە گریانم
هاتی و داوای بەخشینت کرد
باسی عەشق و
خۆزگەو، هیوای نەخشینت کرد
هاتی و زۆر بە جەسووریەوە
دووبارە عەشقت پەخش کرد
لە دەروونی مەخموریەوە
گوڵم هاتی و ئەم هاتنەت
ئەم پرۆژە و
داوای لێبوردن کردنەت
هەرچەندە زۆریش درەنگ بوو
نەتدەزانی من بەبێ تۆ
ئاسودەییم، هەراو جەنگ بوو؟
بەڵام قەینا گوڵی سوورم
لێت دەبوورم
چونکە عەشقت لەناو دڵم
هێشتا بە زیندویی ماوە
سنەوبەری هیواکانم, لەگەڵ تۆدا
پیر نەبوەو نەچەماوە..

کوردستان- هەولێر
24.11.2002

# لووتکەی ونبوون

چۆنێک ڕۆییم، هەنگاوم نا
شۆستەی تەمەن، بەرەو بزربوونی بردم
بۆهەرشتێک ئاماژەم دا
قەدەر نائومێدی کردم
بە بەختم گوت
بۆ بێدەنگی لە ئاستی من؟
بۆ هەمیشە حەزت وایە
لەناو ببەی
ئومێدو حەزو خواستی من؟
بە فیزەوە
بەخت وەڵامی دامەوە
(کاتم نیە گوێت لێ بگرم
جارێکیتر، ڕووی خۆت نەکەی بەلامەوە)
من بێ کەسم
تەنیا شیعر مەردی خوایە و
دڵنەواییم دەداتەوە
لە ئەو بترازێ کێ هەیە
گرەوی خۆی بباتەوە؟.

کوردستان- هەولێر
26.11.2002

# ئەزو بەفر

ئەی بەفرەکە، دە ببارە
ڕەنگین تر بکە ئەم کەژ و
ئەم دارو بەرد و زنارە
بەسەر جەستە و
بەسەر دڵ و
بەسەر رۆحم داببارە
ئەو رۆحەی وا چەندین ساڵە
وشک و بێ ڕەنگ
تامەزرۆی سەوزیی بەهارە
دەخیلت بم ئەی بەفرەکە
دەستم بگرە و بمبەرەوە
دڵی ڕەقم
وەکو خۆت نەرم کەرەوە
کە ساڵانێکی درێژە
لەگەڵ سەراب لە ژووانە و
بە خەیاڵی هەندەران و سەفەر، گێژە
من دەزانم، لەنێو کورددا
شورەییە، لە بەڵێن پاشگەز بوونەوە
بەڵکو هەوڵێکم بۆ بدەی
(داب)ی کوردم
بۆ بگۆڕی لە بوونەوە

تا گەر ڕۆژێک
پاشگەز بوومەوە لە سەفەر
لام شتێکی ئاسایی بێ
دە ببارە و
با ئەم شێتی و نەفامیەم ، کۆتایی بێ!.

کوردستان- سلێمانی
21.12.2002

# نەدركاندن

ئەو خیانەتەی من بینیم
ئەگەر بێت و، بیدرکێنم
گەورەترین
قەسابخانە
لە كرماشان دەسازێنم!..

كوردستان- كرماشان
24.12.2002

## بۆ نایەوە؟

تا سەر ئێسقان بیرت دەکەم
بەو ڕادەیەی
نازانم مردووم، یاخود هەم
ئەمجارەیان، نەک تەنیا من
ئاشنا و دۆست و
ناحەزانی بەرەی دووژمن
گوڵە وشک و سیسەکانی
نێو مەرکانەی خۆشەویستی
حەی کردنی
خەڵوەتگاهی تۆ پەرستی
جل و بەرگ و
چرپاو سەرین
ئەو شتانەی بڕیارماندا، پاش بۆیەک بوون
بیانگۆڕین، لایان بەرین
دەرگاکانی
باخچەی ڕماوی خۆشڕەنگی و
کتێبخانەی ژوورەکەشم
رۆح و جەستەو
دڵە لەخۆم دوورەکەشم
بۆ هاتنەوەت
ئارامیان لێ هەڵگیراوە
چەمەنی سۆز

بیابانی کەس نەکێڵە و
دووربێ لە تۆ، گەڵاڕێزانە ئەم ناوە
غەمی دووریت
وا خەریکە
تاڵتردەکا ئەم ژیانە
بۆنایەوە بێیتە هانام
ئایا هاتنەوە تاوانە؟!..

ئێران- تاران
27.12.2002

## لێدوان

بۆچەند ڕۆژێک سمێڵ چەوری
خیانەتم
لە نەتەوەو نیشتمانم نەکردووە
دۆسیەی ڕابردووم بێ گەردە و
قەت کڕنۆشم
بۆ نامەردان نەبردووە
زۆربەی ژیان
دەربەدەر و
کەسێکی خراپ ئەحواڵ بووم
هەردەم هاوڕێی لێقەومان و
نابوودی دەردو مەحاڵ بووم
هەبوون یەکجار بەهیوا بوون
سیخوڕی بکەنە ئاڵا و
دایچەقێنن لە ویژدانم
تاکو دواڕۆژ
ڕووم ڕەش ببێ
لە بەرامبەر نیشتمانم
هەبوون هەردەم چاوەڕێ بوون
لە(یانە)ی خۆفرۆشیدا
لە نێوانی
نەشئەبوون و سەرخۆشیدا
قومێک فۆدگای بێ ویژدانی

لەگەڵیاندا بخۆمەوە
تا وەک ئەوان
ببمە گورگی مرۆڤ خۆر و
جارێکیتر، بۆماڵی حەق نەڕۆمەوە
بەڵام پاشان
وەڵامێکی دەم شکێنم بۆ ناردنەوە
بۆئەوەی کە، یەکمان بینی
لە باوەڕم سڵ کەنەوە
کەچی سەرەڕای ئەمانەش
خەجاڵەت و خەتابارم
هەموو کاتێک
لە زیندانی سۆزداریمدا، لە ئازارم
خەتایەک نا، لە دەوروبەر
تاوانێک نا
لە هەڵوێست و لە کردەوە
بەڵام تاوان لەو ئافرەتەی
بە دەیان جار
پانتۆڵی خۆی بۆم کردەوە!..

ئێران- تاران
30.12.2002

# حەوت کورتە نامە

ئەو دەمانەی لە کۆڵانە ئەرخەوانیەکانی دیمەشق، بەدەم زریانی غوربەتەوە عەتری غەمەکانمان دەرژاندە سەر تیشێرتی خۆشبینی!..

## نامەی یەکەم:

چەند چرکەیەکی کەم ماوە
مۆمیکی تر، لە تەمەنمان بکوژێتەوە
وەک ئێستاکەی
ساڵی پارم بیردێتەوە
کاتێ ئەوەندە مەست ببوین
ترساین لەوەی
سەری ساڵمان بیرچێتەوە
حەزمان دەکرد، دوایین پێکیش بنۆشین و
لە دەستمان بەرنەبێتەوە
خۆزگە ئێستا نەسیمێ بێت
رۆحی وێڵم
بۆ شەکرەشام بەرێتەوە..

ئێران- تاران
31.12.2002

نامەی دووەم:

من وتۆ، دوو هاوشێوەی یەک
دوو مرۆڤی مەرگ دیدەین
هەتا ئێستاش، بەدوای بوخچەی هیواکانمان
قەرەج و وێڵ و گەڕیدەین
بە نیازی
تەمەنی پڕ بەختەوەری
تۆ ئەوروپا و
وڵاتی شامت پشکنی
مۆسکۆی سپی و
قارەی(چەکوش و داس)ی ناکامت پشکنی
منیش چوارپارچەی لەتکراو
وڵاتی مەرگ و ئەنفال و
نەخشە و ئاڵای زەوتکراو
نە تۆ لەژێر دارگێلاسی حەزەکانت
کۆرپەی دڵت، حەسایەوە
نە منیش دوای ڕۆیشتنت
غەریبیم پێ نوسرایەوە..

ئێران- تاران
31.12.2002

**نامەی سێیەم:**

**بەیانی یەکەم ڕۆژی ساڵ**
**دەچمە دادگا**
**سکاڵا دەکەم کە ئەمڕۆ**
**جانتاکەیان لێ فڕاندم**
**خۆشیان فڕین هەروەکو با!..**

ئێران- تاران
**31.12.2002**

## نامەی چوارەم:

ئا، بەڕاست بیرم کەوتەوە
لێرە دادگا قسەی قۆڕە
دزو شەقاوە ئازادن
شۆڕشگێڕیش وەکو پڵنگی نێو تۆڕە
مرۆڤ بەدەست
یاسای ڕەشی
ئایەتوڵڵاو ئاخوندەکان
زمانی لاڵ، چاوی شۆڕە
تۆکێت پێ باشە، پێی بڵێین؟
سا دەخیلە
ئەم بارودۆخە بگۆڕە..

ئێران- کەرەج
1.1.2003

## نامەی پێنجەم

ئایا لای ئێوەش هەروایە؟
بیلامانێ
دادوەری شار، کۆنە هین و
کەشتی یاسا ڕوو لەبایە
ئایا لای ئێوەش هەروایە؟..

ئێران- کەرەج
2.1.2003

نامەی شەشەم:

لە ئەسفەهان
نهێنی قووڵی بەدبەختی و
چارەکەیم بۆ پرسی بووی
لە ئیمێڵی دوێنێکەما
کورتەی دەنگوباسی خۆم و
غەمی دووریم بۆ نووسی بووی
ئەمڕۆ، شتی سەیرتریش
هاتنە نێو کۆگای خەیاڵم
ویستم گشتیت
بە ئیمێڵێک بۆبنێرم
بەڵام چیبکەم
لە دەست گیرفانی بەتاڵم؟..

ئێران- کەرەج
2.1.2003

## نامەی حەوتەم:

نەفرەت لەو سنوورانەبێ
کە، لە تۆیان داپڕاندم
بۆ تەمەنێک
لە هەواڵ و بەسەرهات و
ئەڤینی تۆیان پچڕاندم
با هەردووکمان هاواربکەین
نەفرەت لەو سنوورانە بێ
لەو ڕێگایە دوورانە بێ
با دونیا هێشتا لە گوندێک
زێدەتر بچووک بێتەوە
چۆنێک هەنگاومان هەڵێنین
نیگای چاومان
بەرامبەر یەک بشنێتەوە!..

ئێران- تاران
3.1.2003

# سەمەرەی عەشق

خۆشەویستیت
نە یەقینە، نە گومانە
عەیامێک لووتکەی خۆشبینی و
زەمانێکیش، ئەوپەڕی لێک دابڕانە
سالانی سال
لە نێو دلت فەرامۆشم
ساتێکیش دێیت و پێم دەڵێی
بە عەشقی تۆوە دلخۆشم
چەندە سەیرە؟
تۆ مرۆڤێکت خۆشدەوێ
ڕقیشت لێی دەبێتەوە
ڕۆژێک ئاوێتەی دەبیت و
ساڵێک بیرت دەچێتەوە
تۆ بەهاریت
بەڵام خونچەش
لە پارکی هەستت ناپشکوێ
تکا دەکەم حالیم بکە
بەم نەزیفی عاتیفەیە، دەگەینە کوێ*؟.

نەزیف: خوێن بەربوون.

ئێران- تاران
5.1.2003

## وەڵام

کە دوو کە سی نائاشنا بە سۆزو دەروونی یەکتر، لەنێو بانیۆی لەزەتەکانیاندا ڕووت دەبنەوە، خۆشەویستی دەبێتە گەرماوی درۆیەکی کاتی!.

**لە پەیامی ئەمجارەتدا**
**دیاربوو خامەت**
**مەرگ و ڕەشبینی لێ دەتکا**
**بۆت نووسیبووم**
**(پاش دابڕان**
**فنجانی نێو لەپی خۆشنوودیم، لێ شکا)**
**هێی نێونەمام**
**تۆ ناتوانی**
**بەم وتانە داگیرم کەی**
**بەڵکو جارجارە بۆت دەشێ**
**لە گوڵزاری هەستی پەرتم، دڵگیرم کەی**
**بێ تاوانم**
**چونکە یەکەمجار بە پاکی**
**مەبەستی خۆم تێگەیاندی**
**ڕاستگۆیانە**
**ماڵی سۆزو ویژدانی خۆم پێ ناساندی**
**پێم گوتی کە، پەیوەندیمان**
**یەکگرتنێک**

له ڕێبازی سۆزداریدا پێک ناهێنیٚ
یەکتر ناسینمان کاتیە و
ڕۆژێک دادیٚ
لێک داب‌ڕان
من له بەیرووت دەتۆرێنیٚ
فێرم کردی، قەت پێم مەڵیٚ
دەرگای عەشقت
کەی به ڕوومدا دەکرێتەوه؟
تەنیا بڵیٚ
(با ئەمشەویش گڕی جەستەم
به لافاوی ئاوێزان بوون, بکوژێتەوه)!.

ئێران- تاران
**10.1.2003**

# روخساری گوڵ

به یادی ئێواره فستقیه‌کانی ئێرەو شه‌وه عه‌ننابیه‌کانی ئه‌وێ، کاتێ ئۆتۆبوسه ماندووکانی شه‌هوه‌ت یاسای ترافیکه‌کانیان پێشێل ده‌کردو له بازگه‌کان نه‌ده‌وه‌ستان.

له شه‌مه‌نده‌فه‌ر دابه‌زیم
شۆخێکم دی
نوقمی غه‌م و نامۆییه
له چاوه‌کانیا خوێندمه‌وه
وێڵی که‌نار مه‌رگی جه‌فاو بێ که‌سیه
به نیگایه‌ک
ئاوێزانی یه‌کتری بووین
دوای ئاشنابوون
له نزیکمان باغێک هه‌بوو
بۆ ئه‌وێ چوین
دیاربوو ئازاو جه‌سوورتر بوو
له روخساری خه‌م لێ نیشتووی شه‌رمناویم
گوتی وه‌ره
ببه ئه‌ندازیاری جوانی
له باڵه‌خانه‌ی ته‌نیاییم
گوتم ئاخر من غه‌ریبم
خه‌ڵکی شاری

ئەنفال و زیندەبەچاڵم
هیلاکی دوای خەیاڵێکی پرتەقاڵیم
بۆیە ناشێ
تۆش بکەمە
ڕووگەی ئەودیوی خەیاڵم
ئەم دیدار و پیاسەیەشمان
بۆ چوونە ناو دەریای قوڵی ئەڤین نیە
هوتافی من ڕاستگۆییە و
هەردەم ڕاستیش
پێوانەی خۆشەویستیە
رۆحم نوقمی عاتیفەیە و
نامەوێ تۆش، لە ماڵپەڕی غەریبیمدا
وتەی عەشقم بۆ بنووسی
گەرناتوانی
گڕی ئارەزووم خامۆش کەی
ئیتر هەرگیز لێم نەپرسی!..

ئێران- کەرەج
13.1.2003

# بڵندتر لەچیا

بۆ رۆحی پاکی (هێمن)

- 1-

ئەمڕۆ تاران
گەردەلولێکی سەرشێت بوو
هەڵیکرد و
تۆزی دووری لە هەناسەو بینم ئاڵا
بە یادی سیمای وڵات و
ئێوارەکانی بن قەڵا
دوور ڕۆییم و
لەناو شۆستە کڕەکانی
(ثارکی میللەت) گیرسامەوە*
نیگای چاوم
بە چەندین پەیکەر ئاشنابوو
بەڵام هیچیان دڵخۆشیان نەدامەوە
ئاوڕێکی
سەرەوژێری خۆم دایەوە
سەعدی و حافزی شیرازی و
شەهریاری ئازەربایجان
لای سەرووشم
نیماو فیردەوسی و خەیام و
ئەبوو رەیحان
لەلای چەپم

ناسرخوسرەوی قوبادی و
ئیبنی سینای هەمەدانی
لای ڕاستم، میرزای شیرازی و
باباتاهیری عوریانی
پرسیارم کرد
ئەی کوا پەیکەری مام هێمن؟
ئەو مرۆڤەی هەموو تەمەنی خۆی بەخشی
بۆ ئازادی و
بۆ ڕووخانی قەڵای دوژمن
بەڵام گەورەم
پاش سەدەیەک چاوەڕوانی
کەس وەڵامی نەدامەوە
بۆیە منیش
بە تووڕەیی
پشتم لە باغەکە کرد و
ڕوو لە وڵات، سوژدەم برد و نوشتامەوە
چونکە دەزانم لەوێدا
ناوت گەورە و
پەیکەریشت بڵندترە لە چیاکان
شیعرەکانت
زۆر بەنرخ و پیرۆزترن
لە گشت گەورەیی و بەهاکان!.

-2-

نا، مامە نا
تکا دەکەم، مەیە ئێرە
ئێرە شاری دڵ وعەبا ڕەشەکانە و
گرتووخانەی
پیاوی وەکو تۆ دلێرە
نا، مامە نا
مەیە ئێرە
ناڵە و نرکەی چل و پێنج ملیۆن بریندار
بەهیوای کێ جێدەهێڵی؟
لەکاتێکدا
تۆ ڕیش سپی و
دەم ڕاست و گەورەو سەرخێڵی
وڵات بەتۆ و
هاوشێوەکانت ڕەنگینە
تۆ لەهەموومان کورد تری و
کوردیش دەڵێ
بەرد لەجێگای خۆی سەنگینە!.

-3-

هۆ مامەگیان
دڵنیابە
لەگەڵ گزنگی بەیانێک
دەگەڕێمەوە موکریان
بەیەکەوە
نەخشەو پلان دادەڕێژین
بۆ ڕزگار بوونی نیشتمان
تا هەموومان
لە دیاربەکر تا هەولێر
لە قامیشلۆ تا مەهاباد
بڵێین ئۆخەی
ئێمەش بووینە
خاوەن وڵاتیکی ئازاد!..

**پارکی میللەت**: یەکێکە لە پارکە هەرە خۆشەکانی تاران. دەکەوێتە نزیک (بوزرگ راهی کوردستان). ناو ئەو پارکە بە پەیکەری دەیان شاعیرو نووسەرو مێژوونووسی بەناوبانگی ئێران ڕازاوەتەوە..

ئێران- تاران
20.1.2003

# تەڕبوون لە کەنداوی فیراق

دڵی من سەدان پارچەیە
هەریەکێکیان هەڵەتەی دوای خەیاڵێکە و
نیگەرانە بەم ناوچەیە
بە منداڵی
شەققی تەمەن
پارچەیەکی لێ شکاندم
کە هەرزەییشم هاتەپێش
کچێک هات و
تیکەیەکی لێ فڕاندم
تەنیایی و مەرگی غەریبیش
بەشێکی یەکجار گەورەیان بۆخۆیان برد
ئەوەی تریش
دوای هەرەس و نائومێدی
خامۆش بوو، مرد
لای باکووری
حەساری دڵی ڕووخاوم
لە(سیدنی)دا، لە گیرفانی ژنێک دایە و
لەگەڵیدا دەخولێتەوە
باشووریشی لە فرانکفۆرت
تاو نا تاوێ
بە خەنجەری بۆیەک نەبوون، دەکوڵێتەوە
ڕۆژهەڵاتی دڵی ماندووم

له (فڕۆکەخانەی شام) دا، لێم بزربوو
ڕۆژئاواشی له قامیشلۆ
له ئەڤینی قەیرەکچێک، به فیڕۆ چوو
لەتێکیشم له تاراندا
لەگەڵ خەون و هیواکانم بەجێماوه
پارچەیەکم له بەیرووته و
له کڵێسای ئافرەتێکی
عیسا پەرستم داناوه
چەند بەدبەختم؟
که دەمزانی هەراو زەنای ئافرەت بازی
له دڵم جێی نابێتەوه
بۆ ڕێگەمدا عەشق بێت و
به ئازادی، به ڕۆحمدا بخولێتەوه؟
سەرسام ماوم
ئەم تاڵان و دڵ پارچه پارچه کردنه
چۆن نامکوژێ
له کاتێکدا
ڕقم له وشەی مردنه؟!.

کوردستان- سنه
24.1.2003

# بێ هەڵوێستیی

من دڵنیام
جارێکیتر
هەرگیز بەتۆ ناگەمەوە
بێ گومانم ئیتر ناشێ
باوەشت بۆ بکەمەوە
باش دەزانم
ئێستا نوقمی ئاسودەیی و
منت لە خەیاڵ نەماوە
کەچی پێم سەیرە بۆهێندە
یادت لە دڵم چەسپاوە؟
بێ هەڵوێست بووی
سەدەیەکت لە ژووان و
لە ڕووتبونەوە بیرچۆوە
کاتێک دەتگوت ئاوێتەم بە
جارێکیتر
بۆ دەرەوەی ماڵی تێک ئاڵان مەڕۆوە!..

کوردستان- سلێمانی
10.3.2003

# پرسیار

کە، لە دوایین ژووانماندا
لە باوەشی یەکتریدا تواینەوە
کاتێ لەناو
دەریای ماچی لێوەکانمان
خنکاین و هەم ژیاینەوە
لەو ڕۆژەوە
شنەی پرسیارێکی سەیر
هەست وهۆشی بڕیوە لێم
ئەم چوارشەممە
گەرهاتیەلام
پێش سڵاو و بەخێرهاتن، پێتی دەڵێم
بۆچی لەدوای
تێک ئاڵان و لێبوونەوە
مایۆو سوخمە، پەمەییەکەت
خستە جانتاکەی شانت و
وەک پێشوو، نەتپۆشینەوە؟.

کوردستان- هەولێر
19.3.2003

## گلەیی

جاران هێندە دڵڕەق نەبووی
لە ڕاست منا
هێندە کپ و بێدەنگ نەبووی
لە بەرامبەر، تانەو تەشەری دوژمنا
جاران تۆ تەنیا کەسێک بووی
لە ناخی من دەگەیشتی
بیرتە جارێک منت ڕەنجاند؟
دواتر هەرخۆت
ئاشتت کردمەوەو ڕۆیشتی!
بۆ ڕۆیشتی؟
نەتدەزانی کۆچی سووری ناوادەی تۆ
گەورەترین تراژیدیا
لە ژیانم دەخولقێنێ؟
خۆتۆ ئازیز، لە من زیاتر دڵنیا بووی
هەموو تەمەن
لێک دابڕانێ ناهێنێ!..

کوردستان-هەولێر
15.5.2003

# فەرمانی چاوەکانت

دوێنێ هاتم
لە ژێر تیشکی
خۆری زەردی چاوەکانت
تەمی شیعرێک بڕەوێنم
مەبەستم بوو
چی نهێنی دڵم هەیە
بەهێمنی، لە ئاستت بیاندرکێنم
ئاهـ گوڵەکەم
چەند سەخت بوو
کاتێ بە چاو فەرمانتدا
چرای ڕازم خامۆش بکەم
دەپێم بڵێ
هەتاکو کەی
لە مەیخانەی ڕازی بوونت
قۆدگای دوودڵی نۆش بکەم؟!.

کوردستان-هەولێر
3.6.2003

# شەکرە شام

لەنێو سەرمای
شەوێکی مانگی شوبات و
هەتا سەحەر، هەڵلەرزین لەبەر باراندا
بە شەرمەوە، نوشتانەوە
لە ئاست پاشماوەی کرمێ بووی زبڵداندا
خەوتن لە شوێنی ئەوان و
هەراسان بوونی سەگەکان
بەم حاڵەوە هەنگاو نانیش
لە تونێلی ڕەشی ژیان
شەو تا درەنگانی شەوێ
بادە نۆشی و
سەماکردن، لەگەڵ کچێکی کەنداوی
بیرت بچێ کات درەنگە و
ئەم ناوەش چۆڵ
بە تەنیا تۆ بەجێماوی
ڕۆژانێک مەرگ و برسیەتی
شەوگارێکیش
لە ترسی مافیای دەسەڵات
ڕاکە ڕاکە، بەپێی پەتی
ژووانی کپ و تێک ئاڵان
نائومێدی و لێک دابڕان
غەمی سەختی چاوەڕوانی
وەکو قەرەج

خۆت بەماڵی خۆت نەزانی
بێوەژنێکی تامەزرۆ
سەعات دووی شەو
دەستت بگرێ و
بۆ ماڵی خۆی بتباتەوە
شەوی دواتر
هەمدیس بەدواتدا بگەڕێ و
لەنێو پێکی حەزەکانی بتخواتەوە
ئاخۆ کەسێک
هێشتا زۆرتر
لەم یادگارە سەرمەدیانە
لە شارێکدا تۆمار بکات
ئامادەیە ئەو هەرێمە
وەکو شەکرە شام, ناو نەبات؟!.

کوردستان-هەولێر
4.6.2003

# ئازارێك
# لەگەڵمدا پیاسە دەكات

ئەودەمانەی خۆم و پێنووس
لە حزووری
قەڵای شیعرێک ڕادەوەستین
یان ئەو کاتەی
لەگەڵ خەیاڵ
لە مەیخانەی دڵ سەرمەستین
ئەو گاڤانەی
بە تۆفانی نیگای شۆخێک
(گەرد)ی هەستم دەشۆمەوە
یاخود کاتێک
لە موغانی فەنابووندا
بادەی ئەسەف دەخۆمەوە
کاتێ شەوان، بە ناچاری
بۆ نەهامەتی و، دەیجووری
ماڵی حوزن دەڕۆمەوە
یان ئەو دەمەی
لەسەر ڕێگای هیواکانم
چڵێک گومان دەڕوێنمەوە
دوور لەم بەزمەش
کاتێ ڕۆژنامەو گۆڤارو

تازەترین شیعری سەردەم دەخوێنمەوە
ئەو دەمانە
ئەستەمە خۆشم بزانم
مەحاڵە هیچ کەس شک بەرێ
لە(کوورە)ی هەستی جەنجاڵم
گڕی سووری, چ ئازارێک دێتە دەرێ!..

کوردستان-هەولێر
9.7.2003

## بێ تۆیی

من عاشقی نیگات بووم و
تۆش سەرسامی شیعرەکانم
من بوومە ساباتی شادیت
تۆش حەزی خۆت
کردە هەناسەی ژیانم
من لە ژووانێک خۆم کوشت و
خوێنی دڵم
کردە سوراو بۆ لێوانت
تۆش بە ماچێک
زیندووت کردمەوەو پێت گوتم
زیندوو بەوە، من دەبمە کۆچی قوربانت
من لە بیرمە
لەژێر چناری باغێکدا
سەرت خستە سەرسینەم و
رۆحت طوشیم، لێوت مژیم
تۆش لە بیرتە
گریایت و گوتت بێ ئەڤین
چۆڵستانە ئاسودەییم
من ئەوکاتەی لە زەڵکاوی غەمەکانمان
نقوم دەبووم، تا چەناگەم
تۆ دەبوویە فریاد ڕەس و
ماڵی ئارامی و پەناگەم
من سەحەری چوار شەممەیەک
لە شار تۆرام

جانتای ڕەشی ڕێی نەهاتم کردە پشتم
تۆش لەوێدا
هانت دەدام
بۆ گەیشتن بە ئەنجام و
گورگی دوودڵیت دەکوشتم
من ساڵانێک
خەزانی ڕەشی غەریبی
گوڵی هەستی دەوەراندم
تۆش بەبێ دەنگ
شەوان دەهاتیە خەونم و
سەمای دڵت دەتۆراندم
من لە زستانی غوربەتدا
تەمێک نیشتە چیای هیوام
بۆیە ناچار بووم بێمەوە
تۆش بۆت دەنووسیم، وەرەوە و
حەزم لێیە کاتێ دەمرم
لە باوەشت سەرنێمەوە
من هاتمەوە، بەڵام جەخار
هەر یەکەمان
بۆ دۆزەخی، ضارەنووسێکی نادیار ضووین
تۆش نەهاتیتە باوەشم
بۆیەک نەبووین!...

کوردستان- سلێمانی
21.7.2003

# زرێباری ئەسەف

دیسان سەفەر
دیسان هەمان بێ هودەیی و
زاڵبوونەوەی هەمان قەدەر
دیسان دوا نیگای وڵات و
پیاسەیەکی ئێوارەیی
نۆشکردنی
دوایین پێکی بێچارەیی
دیسان ئازاری دابڕان
بە پەیژەی ئەسەف هەڵزنان
خاتر خواستن
ماڵئاوایی
مەرگی لەیەکتر جودایی
دیسان ژانی دەربەدەری
سوکایەتی و کوێرەوەری
دیسان ئاخ و داخ هەڵکێشان
بۆ سنوورە دەستکردەکان
بۆ زرێبار
بۆ ئەشکی چاوی مەریوان
بۆ کۆیلەیی
جوانیەکانی شاری سنە و
شەقامەکانی کرماشان
بۆ سەربەخۆیی وڵات و
بۆ گەیشتن بە ئاوات و

بۆ کاڵبوونەوەی حەزەکان
بۆ وێران بوونی مەرزەکان
ئاخ هەڵکێشان
بۆ لەبارچوونی چەندجارەی
دووگیان بوونی, بووکی ئەڤین
بۆ ئەوکاتەی
چەقۆی خوێناوی چارەنووس
دڵ و گیانی دوولەت کردین!..

کوردستان- کرماشان
23.7.2003

## مەرکانەیەك پڕ لە گوڵی پەشیمانی

هەبوونەبوو
کچێک هەبوو
کۆنەپەرست و خێڵەکی
خولیای فیتنە و
پیلان گێڕی و دووبەرەکی
دەرچووی بەشی کۆمەڵناسی
بەڵام نەیتوانی تۆزقاڵێک
ڕاڤەم بکاو
هەستی دەروونم بناسی
لە وەرزێکی خەزەڵوەری تەمەنمدا
مەرکانێکم
شیعرو پەیڤی جوان پێشکەش کرد
لە وەڵامدا
نامەی هەڕەشەی بۆ ناردم
خۆی لە ئاستمدا ڕووڕەش کرد
بە دڵتەنگی
وەستام لەسەر لووتکەی بەرزی
شاخی سەختی بیرکردنەوە
بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنم
جارێکیتر، ڕازی دڵم
لە بەرامبەر نەزانێکدا نەدرکێنم!..

ئێران- تاران
27.7.2003

## شیوەن

هەی ڕۆ، هەی ڕۆ
بۆ ئەڤینێک
کە لەدەستم دەرچوو، بێ هۆ
هەی ڕۆ، هەی ڕۆ
بۆئەو ساڵە یەکجار شوومەی
لە سەرەتای گوڵستانی تەمەنمدا
خەزانێک هات
هەڵیوەراند گوڵ و چرۆ
هەی ڕۆ، هەی ڕۆ
لە ئازارێک
هێندەی بەرزایی تانجەڕۆ
کە نیشتوە
لە کەناری دڵی پڕسۆ
هەی ڕۆ، هەی ڕۆ
لە چارەنووسی من و تۆ
پێم نەگوتی
ماڵی عەشقم جێ مەهێڵە و
بۆ مەغریبی زیزبوون مەڕۆ
بۆ ئەوەندە بێ ئەمەک بووی
بۆ ڕۆیشتی، دە بڵێ بۆ؟
هەی ڕۆ، هەی ڕۆ
کوا ئەوعەشقەی، گڵپەی دەکرد

له دەروونی کەسێکی وەک خۆت, تامەزرۆ
هەی لەئاستم خەجاڵەت بی
گوڵە هێرۆ
شۆڕەسواری فێڵ و درۆ!.

ئێران- کەرەج
29.7.2003

# توانەوە
# لەبەر گەرمای غەمەکانتان

بۆ:
تلیاک کێشەکانی تاران، خۆیان و دونیا
پڕ لە مەرگەسات و، جارجاریش جوانەکەیان.

ڕۆحم خاکی ژێر پێتانە
شیعرم هەردەم
لە حزووری غەمەکانتان پاسەوانە
لەگەڵتاندام، کەیەکێکتان
شەوان لەنێو کەلاوەیەک
ڕۆحی پیرۆزی دەردەچێ
دەتوێمەوە
کە دەبینم، عومری سەوزی لاوییەتیتان
لە شۆستەکان بەسەردەچێ
کەس هێندەی من
پەی بە ڕازەکانتان نابا
کەس وەکو من
هەست بە زامەکانتان ناکا
خەڵک گاڵتەی بە ڕووخسارو کردارتان دێت
من برینتان سارێژ دەکەم
ئاتەشگەدەی

گەورەییتان پڕ نوێژ دەکەم
من دڵنیام
کەس نایەوێ بەخۆڕایی
پشت لە بەهاری تەمەن و
ڕوو لەمەرگ و
خەزەڵوەری ونبوون بکا
گەر لە ناخیا
ئازارێکی یەکجار سەخت پاڵی نەدا!..

ئێران- تاران
1.8.2003

## جەنگ

تۆ نە ئەمرۆی و نە دوێنێی
نە گفتوگۆ ناسکەکانی
ژووانی عەشقی سبەینێی
نە ئەفسوونی
سرووشتی پاکی وڵاتی
نە گەشبینی و نە ئاواتی
تۆ ئاوێنەی باڵانومای ئیلهامم نیت
بەرامبەرت
قژی سپی
شیعرەکانم دابهێنم
تۆ سنوورێکی دەستکرد نیت
بە هیوابم
وێرانت کەم، بتڕوخێنم
نازدارێکی گوڵبەدەم نیت
کە پێکەوە بەفری حەزمان
لە گەرماوی خرۆشانێک تواندەوە
بە لافاوی خامۆش بوونیش
چیمەنی ئۆخەی کردنمان، بوژاندەوە
کانیاوێک نیت
بێم و لەلات وچان بدەم
سنەوبەری وشکەڵاتوی ئاسودەییم
لە نزیکت بڕوێنمەوە

شیعرێک نیت لێت بێزارنەبم
ڕۆژێ چەندجار
بە تاسەوە بتخوێنمەوە
تۆ ئوتێلێکی لاچەپی
شاری دڵگیری عومان نیت
تۆ باغێکی پڕ شۆڕەبی
ئەسفەهان نیت
ئەمیان شەوێک
بە هیواوە تێیدا خەوتم
ئەوەی تریان
چەند هەفتەیەک خانەخوێم بوو
کە خراپ هات بەختی چەوتم!
تۆ، هەر یەکێک لەمانە بیت
لە یاداشتی ڕۆژانەی خۆمدا دەتنووسم
دەبمە هاوڕێت
لێت نابمەوە
لەگەڵ تۆیە چارەنووسم!.

ئێران- تاران
3.8.2003

## دڵۆپێك لە دەریا

حەیران دەڵێم
وەرزی بەختم کرێوەیە
نەک هەر زستان
بەهاریشم ڕێبەندانە و
سایەقەی کۆچ بەڕێوەیە
حەیران دەڵێم
کەوتومەتە چاڵی مەرگ
بەم ناوەختە، کوا کێ هەیە دەرم بێنێ
نەغمەی غوربەت کاسی کردووم
هێندە نزیک
بەسەرمدا دەنەڕێنێ
حەیران دەڵێم
ڕەشەبایە سروەی تەمەن
زامەکانم وا خەریکن
ماڵی هیوام وێران دەکەن
دڵی چۆڵم بێ ئازیزە
نازدار حەیرانم لێ زیزە
لەگەڵ مەحاڵ پەڕەلێڵم
جۆگەڵەی خوێنی بەستووە
هەستی وێڵم
کێ وەکو من دڵ بەسۆیە
کێ وەکو من هاوڕێی غەمان
کێ وەکو من بەرەڵلایە

لەسەر شۆستەی چۆڵی ژیان؟
حەیران دەڵێم
تاکەی نەگەمە بینینی
تیشکی زێرینی خۆرهەڵات
ئۆقرەم نەما
دەپێم بڵێ
بۆهەر نابمە خاوەن وڵات؟..

ئێران- کەرەج
4.8.2003

## بانگەواز

هەفتەیەک بوو لە دیمەشق
لە کۆڵانێکی سامناکدا
شەوان، ڕۆژم دەکردەوە
لە بەیرووتیش
بە هەمان حاڵ
ڕۆژانێکی لاویم ڕۆیی
بەدەم هەناسەی سەردەوە
شەماڵێک گوتی تەرابلوس
باژێڕێکی پڕ لە سۆزە و
قەدری غەریبان دەزانێ
کە چووم، ئەویش
پەلکێشی کردم بۆ مەرگ و
کونجی تاریکی زیندانێ
بارگەی بەدبەختیم لە کۆڵنا و
زەردەپەڕێک
لە تەرمینالی هەمەدان
چەقۆی ئافات، هات و پێشوازی لێکردم
هەر لەوێدا
کەوتە گیانی هیواکانم
ئای چ پەندێکی پێ کردم؟
خۆ لە وڵاتی خۆشمدا
بەختم باشتری نەهێنا و

لە دۆزەخی غەریبیدا توامەوە
هەولێر شەقێکی تێهەڵدام
لە قامیشلۆ گیرسامەوە
غازی عەنتاب خۆی لێم ڕەنجاند
دیاربەکر باوەشی بۆ نەکردمەوە
سلێمانی دەریکردم
زاخۆی دەلال
بۆ باوەشی پڕ سۆزی خۆی نەبردمەوە
بۆیە ئێستا
دەمەوێ مافی مرۆڤ و
ڕاگەیاندنی جیهانی و
ڕێکخراوە خێرخوازەکان ئاگەدارکەم
بێن و چارێکم لێ بکەن
بانگەوازم
بە گوێچکەی دونیا دابدەن
بڵێن مرۆڤێک ونبووە
هەرچەند دەکا
ڕێ دەرناکا
بۆ گەڕانەوەی نیشتمان
بەڵکو یەکێک خۆی بە خاوەنم بزانێ
لە وڵاتانی گشت جیهان!..

ئێران- تاران
**15.8.2003**

# سنوور

سنوور یارو ئازیزانی
لێ پەرت کردم
بە بەرچاوی هەموو دونیا
نیشتمانی کەرت کەرت کردم
کۆستیان کەوێ
کاتێ لەوێ
شیعرەکانیان لێ خنکاندم
سنوور نەیهێشت
وەک پاساری لە باڵدەم و
لە پرسەیان ئامادەبم
بەڵکو گرمەی هەوری ڕقم ئارام ببێ و
پشکداری ئەم یادەبم
هەر سنووربوو ڕێگای نەدا
لە نەهاتی و
لە پایزی ڕەشی وڵات
بڵێم یارێ
خۆم و سۆزو وشەکانم
کراسێکی گوڵ دامانین، پڕ بەباڵات
سنوور لەمن بووە پەتا
تەزووی یادە جوانەکانی
لێ پچڕاندم، هەتا هەتا
خەراباتە و

چواردەورم هەمووی سنوورە
دڵی ئومێدم بێ ترپە و
چاوی گەشبینیم بێ نوورە
لەبەر سەگی
کەڵبە تیژی سنوورەکان
دەستەوەستانم ناوێرم
دەردی دڵم بەیان کەم و
لە نامەیەک
بۆ کوردستانی بنێرم!..

ئێران- تاران
14.9.2003

## ئۆقیانووسی ئەڤینداری

کێ دەڵێ تۆ
ئێستاش هەمان
خۆشەویستی جارانم نی؟
کێ دەتوانێ
بڵێ تۆ چاوگەی خۆشبینی و
ڕێژنەی خەندە بارانم نی؟
چۆن ڕەوایە
لە یادت کەم
ئەی درەختی بەرزی عومرم؟
لە تۆ زیاتر
کێ بە رۆحی من ئاشنایە و
لە سایەیدا ئۆقرە دەگرم
کێ وەکو تۆ
لە کەناری ئۆقیانووسی ئەڤینداری
غەمەکانم دەشواتەوە؟
دەروازەی گەورەی داهێنان
لەسەر بەژنی شیعرەکانم دەکاتەوە!
نا گوڵبەدەم
هزر نەکەی غەمی دووری
لە غەمی تۆ گران ترە
وا تێنەگەی
سەرما خواردی زستانێکم

له تاعوونی لێک دابڕان، پڕ ژان تره
من هەمیشه
هەناسەم لەگەڵ هەناسەت
ترپەم لەگەڵ ترپەی دڵت
ئازاریشم
هاوسێی غەمەکانی تۆیه
بۆیه ئێستا
خۆشم تەواو دڵنیا نیم
دڵم چەند بۆت، پەرێشان و تامەزرۆیه؟!.

ئێران- ئەسفەهان
22.9.2003

## دۆتمام

هێندە جوانی
ئیلهامی شیعریش لە ئاستت
لە گۆ دەکەوێ زمانی
هێندە گوڵی
لە ناسکیی، پڕ بەدڵی
هێندە بەعیشوەو بەنازی
کە لە بەژنت ڕادەمێنم
وەک نەمامێکی تۆڵازی
هێندە پاک و میهرەبانی
نازانم ناوت بنێم چی
ئەی سەرچاوەی کامەرانی ونیگەرانی؟
لەنێو ئەم دونیا بەهاریەت
چەند دڵتەنگم کە دەبینم
گەیشتن بەتۆ مەحاڵە
ئەی خوا ژنی
جیهانی چۆڵی ئەڤینم!.

کوردستان- سنە
24.9.2003

# شیتەڵ

هەرچەند ئاوڕ
لە گەنجێتیم دەدەمەوە
چی نابینم
ژیانی پڕ ناسۆر نەبێ
چەند بۆ دواڕۆژ هەنگاو دەنێم
شتێکی تر بەدی ناکەم
لووتکەی هەرەسی زۆر نەبێ
ئاهورا، کەی
ڕێگایەکم نیشان دەدەی
بچێتەوە بۆ نیشتمان
بەڵکو لەوێ بە ئارامی سەرنێمەوە
ڕزگارم بێ
لەدەست ئازاری هەندەران!.

ئیماراتی عەرەبی- دوبەی
6.11.2003

## مردن له دەروازەی تەنیاییدا

لەو ڕۆژەوەی کە لێت دوورم
ڕەنگم ڕەنگی
مردوویکی چەندین ساڵەی لێ نیشتوە
هەوێردەی وەرزی ئەڤینم
لەسەر چڵی
ماتەمینی هەڵنیشتوە
لەو ڕۆژەوەی کە لێت دوورم
هەست بە ترپەی دڵم ناکەم
سەرم بۆتە
مەکۆی ژان و ئازارو غەم
لەو ڕۆژەوەی کە لێت دوورم
بەرگی خامۆشیم پۆشیوە
لاتەریکم، کزم، پەستم
بادەی مردنم نۆشیوە
لەو ڕۆژەوەی کە لێت دوورم
گورگی مەنفا
بەربۆتە لاشەی بێ هێزم
تۆ لێرەنیت
تا بێباک بم لە مردن و
بێیت و بتگرمە ئامێزم!.

سیدنی- ئوسترالیا
**10.11.2003**

# پیاسەیەك لەگەڵ خودا

دەڵێن خودا
تاک و تەنیاو بێ جێگایە
کانیاوێکە
سوچێکی پڕ لە شیرناوی وەفاداری
لایەکیشی
تەژی ژەهراوی جەفایە
دەمێک دەڵێن
خودا دڵ ڕەق، تۆڵە سێنە
ساتێک دەڵێن
میهرەبانێکە بێ وێنە
خودایان وا لێکردووە
نازانین چۆن پێناسی کەین
کاتێ لەسەری دێینە گۆ
بە گومانین
چۆن و لەکوێوە باسی کەین
لای من خودا
پرسیارێکی هەمەجۆرە
گوزارشت و
لێکدانەوەو مانای زۆرە
ڕەنگە خودا
زەردەپەڕی ئەو ئێوارە جوانانە بێت
لەسەر قەڵا، بە سێ قۆڵی*
دەمان ڕوانیە ئاوابوونی
یان ئەفسوونی
ئەو ئیلهامە ئاڵۆزە بێت
پەستم دەکا، هات و چوونی

دەشێ خودا
خەندەی سەرلێوی کچێک بێت
کاتێ پێم گوت
تا دەمرم دەکەم چاوەڕێت
ڕەنگە خودا
پێنووسێک بێت لەناو دەستم
یان شەماڵێکی پڕ بۆن بێت
گشت ئێواران
خۆی بخزێنێتە نێو هەستم
من دەڵێم خودا لەزەتی
ئەو شیعرەیە
کە تائێستا نەم نووسیوە
یاخود نیگای
تابلۆی سووری نیشتمانە و
ئەوەتانێ، لە دڵم هەڵمواسیوە
ئای خودایە
تۆ هەرچی بیت، تۆ هەرکێ بیت
دڵنیا نیم
نازانم لێرەی، یان لەوێی
هێندە نەبێ
هەرگیز لەتۆ نەترساوم
بەڵام جارجار خۆشم دەوێی!.

*:مەبەست لە قەڵای هەولێرە.

ئوستراليا- سيدنی
15.5.2004

# سروودێکی خوێناوی

من حەز دەکەم
لە زیندانێک هەڵمواسن
زامەکانم خوێی تێبکەن
دەیان جەللاد و چەقۆکێش، بمکوتنەوەو
بۆحەوت پشتم تەمبێ بکەن
بە ئومێدم
لەناو دەریای غەم بخنکێم
بەجۆرێ سەرم هەڵگرم
کەس دڵنیا نەبێ لە کوێم!
چەند پێم خۆشە
بۆ مردنی ئازیزانم
بگریم، هەردەم قوڕ بپێوم
لە تەمەنما
پاساری زەردەخەنەیەک
هەڵنەنیشێ لەسەر لێوم
ئۆخەی دەکەم
لە ماڵمدا
نانە ڕەقەیەک شک نەبەم
کێشەکانم
ئەوەندە سەخت و ئاڵۆزبن
خۆشم سەری لێ دەرنەکەم
نزا دەکەم، ماڵم بڕمێ

بێ پەسێو و دەربەدەربم
هەتا ماوم
پێ بە کۆت و دەست بەسەربم
هیواخوازم
ببمە گاڵتەجاری خەڵک و
شورەیی بێت، لەهەر شوێنێک ناوم بێنن
نەک ناحەزان
دۆستانیشم
لە دژمدا ڕاوەستن و
بەیداخی ڕق لەسەر ڕێگام بچەقێنن
خۆزگەو هەزار خۆزگەی تریش
چەقۆی مەرگ
لە خوێنی خۆم بمگەوزێنێ و
جەرگ و دڵم ئەنجن بکا
کێشەیەکم بێتە پێشێ
دونیام لێ پڕ دوژمن بکا
بە ئاواتم
وەک منداڵێک، لە ئەنفالدا بەجێمابێ
پەڕاگەندە و بێ لانەبم
بەڵام هەرگیز
بێ وڵات و ئاڵا نەبم!.

ئوستراليا- سيدنی
**6.6.2004**

## کزبوونی چرای ئومێد

چەند پڕ ئازارە ژیانێک
نە کەسێک هەبێ تێت بگا
نە مرۆڤێک
لە عەشقی خۆیت تێربکا!
دەسا ئیتر
ماڵئاوا ئەی بەختەوەری و
ماڵئاوا ئەی عومری جوانیم
زۆر ئەستەمە
جارێکی تر
بخزێمەوە ناو نوێنی کامەرانیم!.

ئوستراليا- سيدنی
24.6.2004

# وانەی خەجاڵەتیی

مامۆستاکەمان پێی گوتین
هەستن لەناو چوارچێوەی ئەم نەخشەیەدا
هەر یەکێکتان
وڵاتی خۆیمان نیشاندا
ئەوەی هەڵساوە بە چوستی
مەفتەنی خۆی
پێ نیشانداین, بە سەربەستی
چین و ڤێتنام و ئۆکرانیا
عێراق و چاد و ئیسپانیا
چیچان، ئەفریقیا، پۆڵەندا
ئەندەنوسیا و نیوزلەندا
ئەمیان گوتی
من کرواتیم
ئەمەش سنووری وڵاتم
ئەویان گوتی
منیش سودانە ڕووگەم و
ئای کە چەندە بۆ چوونەوەی بە ئاواتم
منیش بەوپەڕی دڵتەنگی
لە سوچێکی پۆلەکەدا، هەڵکورمابووم
بە پەشۆکاوی و بێدەنگی
لەپڕ مامۆستای نیازپاک، هەڵیدایێ
ئادەی هۆ کاکی قوتابی

بێ بەڵابی
تۆ دەمێکە, دەستپێکی هەموو پەیڤێکت
تەنیاو تەنیا نیشتمانە
دەڵێی خاکم
بەهەشتێکی پڕ لەگوڵە
ئاتەشگەدەی دڵدارانە
فەرموو وەرە
لەسەر ئەم نەخشەی بەردەممان
وڵاتی خۆتمان نیشاندە و
کەمێک پێمان بناسێنە
بە هەندێک باس و زانیاری
هۆش و بیرمان بتاسێنە!
شڵەژام و مەلول وەستام
گوتم بەڵێ ئازیزانم
نیشتمانم
جێگای کۆنترین شوێنەوار
لانەی عەشق و هۆنراوەیە
نیگای سۆزی پڕ لەبەهار
وەک گوڵ هەردەم گەشاوەیە
بەڵام چیبکەم نەگبەتیە
ئەم بەهەشتەیان لە خاچدا
بۆیە ئێستا
لەسەر نەخشە شوێنی نیە
هەموویان ڕوویان تێکردم
تا ماندوو بوون
تێرتێر گاڵتەیان پێ کردم

گوتیان کە تۆ
لە خۆشەویستی وڵاتدا
وانەبێژی هەموومانی
نەمانزانی درۆ دەکەی
خۆت بێ خاک و نیشتمانی
منیش نەمزانی چی بڵێم
خەجاڵەت بووم، سەرم شۆڕکرد
کەسایەتیم
لەبەر چاویان، بە یەکجار مرد
لەو ڕۆژەوە
ئومێد دەکەم
کەسێک ئەگەر بێ وڵات بێ
وێنەی من، وەکو گاڵتەجاڕ
مردنی خۆی بە ئاوات بێ!

ئوسترالیا- سیدنی
12.7.2004

# ئەنفلەوەنزای غوربەت

خەڵک وێڵی
کامەرانی و خۆشحاڵیە
منیش نوقمی
دەریای قوڵی پڕ لە گریان
خەڵک مەستی
دیمەنی پڕ لە جوانیە
منیش شەیدای
سەحرای چۆڵی لێک دابڕان
خەڵک تووشی
ئەنفلەوەنزای مەرگ دەبێت
دەمرێ و، ئیتر دەبڕێتەوە
منیش تووشی
ئەنفلەوەنزای غوربەت هاتووم
نە دەمکوژێ
نە لەکۆڵم دەبێتەوە!.

ئوستراليا- سيدنی
1.1.2006

## نرخی پێڵاو

گەر پێڵاوێک
هەرچەندە کۆن و دڕاو بێت
لە چەند لاوە هەڵزڕاو بێت
بەڵام لەکاتی تەنگانە
تۆ بڕۆ هانای بۆ ببە
بزانە چۆن
دێتە فریادت مەردانە؟
چۆن لە پێی کەی
هەر چۆنێکی بەکار بێنی
ئەو بێباکە
لە ئەنجامدانی ئەرکی خۆی
لە پاراستنی نهێنی
کەچی سەیرە
لە کاتێکدا
هێرش دەبەین, بۆ کەسێکی سوک و ناپیاو
دەیهێنینە ڕیزی پێڵاو!.

ئوستراليا- سيدنی
9.2.2006

# چات ڕوومی چاوەڕوانی

جاران هەتا
نامەیەکمان دەگۆڕیەوە
تەمی ترسێک، سەرتاپای دڵی دەتەنین
نەوەک ڕەقیب
بەو نهێنیەمان بزانێ و
هەرەس بێنێ، بە شۆڕشی سەختی ئەڤین
کەچی ئێستا
لەو سەردەمی
داتا و مەسەج و ئیمێڵە
بۆ ئەو دڵەم
ئەوەندە بەدوای هەواڵ و
نامەیەکی تۆدا وێڵە؟
گوڵم لەکوێی؟
شەکەت بووم هێندەی بگەڕێم
بە ئێم پی تری سۆزمەوە
بڵێی ڕۆژێک
لە چات ڕوومی چاوەڕوانی بتدۆزمەوە؟.

| | | |
|---|---|---|
| data | : | داتا |
| message | : | مەسەج |
| E-mail | : | ئیمێڵ |
| mp3 | : | ئێم پی تری |
| chat room | : | چات ڕووم |

ئوستراليا- سيدنی
**17.7.2006**

# نیو کاتژمێر

تۆ دەزانی
ئەو کاتانەی
کە ئاوێزانی یەک دەبین
کاتێ لەژێر
دار گێلاسێکی(سیدنی)دا
بەرەو دوورگەی سەوزەلانی عەشق دەچین
ئەو دڵەی من
یەکسەر لە لێدان دەوەستێ
ڕەشەبای مەرگی ناوادەم
بە هیچ شتێک ڕاناوەستێ
خۆ دەڵێن بێجگە لە خودا
کەس ناتوانێ
دڵی مرۆڤێکی زیندوو، بوەستێنێ
کەچی سەیرە
عەشقت فەرمانی یەزدانیش
وەلادێنێ
هەموو ڕۆژێک، نیوکاتژمێر
بە لافاوی ماچی لێوان، دەمخنکێنێ!.

ئوستراليا- سيدنی
1.9.2006

## سێزدەی دە

یەکەم دیدار
بە یەکەم خەندەی سیحراویت
زانیم کە تۆ
خەڵکی شاری بێ بەهارو
دەڤەری وشکی کەنداویت
یەکەم دیدار
لە ترسی تانەی دەوروبەر
زۆر بەپەلە
مۆبایلەکانمان دەرهێنا و
ژمارەکانمان کرد ئەزبەر
کە لەجوانیی چاوت ڕامام
کەنداویەکم بیرهاتەوە
ئێ من چیبکەم
ئەگەر نیگای هەموو شۆخێک
بۆ هەواری یادی ئەوم بباتەوە؟
ئەو مرۆڤەی
نەمدەتوانی بەبێ هەناسەی ئەو بژیم
لەگەڵ ئەوبام
لە تەنیشت کوچەی لەناوچوون
چەسارەت و هەڵسانەوەی پێ دەبەخشیم
گشت ئێوارەی پێنج شەممانێک
سەرم دەکرد
بە بەهەشتی سینەی هەست و

هەتا بەیانی بۆی دەمژیم
بەڵێ کچێ
یەکەم شەوی پەیمان بەستن
هەر دوێنێ بوو
(سێزدەی دە)بوو
کوڕو، کچی نیوە ڕووتی دەوروبەرمان
هەندێک خەریکی ڕاموسان
هەندێک چاویان لە ئێمە بوو
تۆخۆت واتکرد
حەزت وابوو چاوەکانت
بکەمە شوێن و پەناگەم
بەڵام دوندی گەیشتن بەتۆ، ئەستەم بوو
نەمدەزانی قەت پێی ناگەم
چەند ئاسان بوو
(کوورە)ی دڵم جۆش بدەیت و
یۆرانیۆمی خۆشەویستیم بپیتێنی
لە تاقیگای عەشقی مندا
ئەفراندنێک ئەنجام بدەی
خۆت بە دونیا بناسێنی
بەڵام جەخار
ئەندازیارێکی بێ هەست بووی
نەزان، دڵڕەق، خۆپەرست بووی
ئەو قەڵاتە
پڕ لە ئاسەواری ماچەی
خۆت نەخشەکەیت بۆ کێشا
کە وێران بوو

**نەک خەرمانی بێ ویژدانیت گڕی نەگرت**
**ئاهێکیشت هەڵنەکێشا!**
**تۆ هەمیشە**
**دڵتماڵێک بوو لە کەڤر***
**لای تۆ هیچ نرخێکی نەبوو**
**گوڵ و جوانی، ماچ و شیعر**
**تۆ خەزانی پایزان بووی**
**هەر سەرەتا**
**بەهارت هێنا کۆتایی**
**منت کردەوە گاڵتەجاڕ**
**لە گاڵتەخانەی جودایی!.**

*:کەڤر: بەرد

**ئوستراليا- سيدنی**
**17.10.2006**

# مەتەڵ

با شارەزای
هەموو دونیا کۆببنەوە
با ماڵپەڕێکی تایبەتیش
بۆ پرسیار و وەڵامەکان بکەنەوە
ڕێگا بدەن، بە هەرکەسێک
خۆی پێ دکتۆرو زانایە
لە زانستی
نوژداریدا شارەزایە
بێ سەیرکا، دڵێک هەیە
سەدان ساڵە چوار پارچەیە
بە دەیان جار
تووشی نەشتەرگەری سەخت و
ترس و دڵەڕاوکێ بووە
کەچی هێشتا
خوێن بەناویا دێت و دەچێ
هەر وەکو جاران زیندووە
بێ گومانم
ئا ئەم دڵە، تا هەتایە
هەرگیز لە ترپە ناکەوێ
تا دەبێتە
مەتەڵێکی سەرسوڕهێنی ئەم دونیایە!..

ئوستراليا- سيدنی
14.2.2007

## پەیامی یار*

یاری تازە،

زۆر بەنازە

گەردن گازە،

دڵ پڕ ڕازە

خۆمەی شیعر ژینەو

لەوجێی ئاوێنە

ڕوو شیرینە،

دڵ بێ قینە

لەهەردوو چاوی دیارە،

نەقۆزو ئەڵقلینە

وە فادارە،

بێ قەرارە

قەوێش خواوکو

فەنەژاکاو لەمدارە

قەولی داوە،

هەتا ماوە

بەدڵ و گیان

راوەستاوە!

* کاتی خۆی ئەم تێکستەم بۆ ئاوازێکی ئامادەکراو نووسی و لەلایان گەنجێکی دەنگ خۆشەوە کرا بە گۆرانی، کە ئێستا بە داخەوە نەناوی ئەو گەنجەم لەیاد ماوەو، نە گۆرانیەکەشم لەلا دەست دەکەوێت!.

کوردستان-هەولێر

24.2.1995

# چرپەی تامەزرۆیی

لەناو دەریای قوڵی عەشقا، تۆی سەرچاوەی ڕێچکەی شیعرم
گەر جێم بهێڵی و بتۆرێی لە تاوی تۆ بێشک دەمرم
میـحرابی ئـەبرۆی کـەوانت سـوجـدەگاهی ئیـلاهـیە
پەری ئاسـا هەنگاونانـت بـۆ جـوانی تـۆ گـەواهیە
لـە ئاسـت بـاڵات نـایەتە گـۆ چرپـەی سـۆزی دەربڕیـنم
ئەوەندە چویتە چاومەوە، بە کوێریش تۆ هەر دەبینم*
سیـحری نیـگای چـاوی بـازو خۆشەویـستیت شـێتانەیە
ئـەوینت مـایەی سـاڕێژی زامـی دڵـی دێـوانەیە
تـریفـەی مانـگی ڕوخـسارت چراخـانی تـاریکیمە
شـکۆفەی دوولێـوی ئاڵت، نەشئـەی بـەهاری مەستیمە!.

* نیو دێڕە شیعری(فەرید زامدار)ە.

کوردستان-هەولێر
20.9.1997

## جـــەفا

کـە لـێم ڕەنـجای و ڕۆیشتی، شــادی لەگـەڵتا کـۆچی کرد
بەهارو بولبول لێم تۆران، خەندەی سەرلێوی گوڵیش مرد
بـۆ نازانـی دووریـت گـڕە، گـیان و دڵـم دەسـوتێنێ؟
لانـەی هـیوام وێـران دەکاو، خــەزان بـۆ گـیانم دەهێنێ
تـۆ خەمێـکی لـە هەنـاوما گـەورە دەبـی و، هەڵـت دەگـرم
سەرچاوەی ئەشک و ئازارو شەپۆلی سۆزی بۆ شیعرم
تــۆ لەدڵمـای، لـە قـوڵایـی دەریــای بێ بنـی ئەوینـای
لە تریـفەی مانـگ و ڕۆژ و، مەشـخەڵی ڕوونـاکی ژینـای..

کوردستان-هەولێر
15.10.1997

# گفتوگۆیەك لەگەڵ رۆحی مامڵێ

قەڵەم وشک و بێ بەهایە، سەیرە زمانم ناگەڕێ
وێڵم بەدوای هەر وشەیێ گەورەیی تۆم بۆ دەربڕێ
کوا، چ شیعرێ هێندەی ناوت بەرزو پیرۆزو گەورەیە؟
بۆ شانازی و سەربڵندی، لەتۆ زیاتر کێمان هەیە!
کوردستانیش لەئاست بەرزیت سەرسوڕماوە، بێ باڵایە
چون بەرزی تۆ، بەقەد بەرزی سێدارەکەی پێشەوایە
من نازانم چی بنووسم ئەم کۆچەی تۆم بیرباتەوە
چ شالورێ بۆی دەسازێ گرەو لەتۆ بباتەوە؟
هێمن ئاسا منیش دەمگوت، لە دونیا هەتا بمێنم
شورەییە لەئاست غەم و پەژارە، سەر دانەوێنم
دەمگوت، هەتا نەوای دەنگە بەسۆزەکەی مامڵێ مابێ
نەغمەی(زەمانە و، زێنەبێ)نابێ لەدڵم تەوەللابێ
لەگەڵ کۆچت(توخوا شوانە و، یادی بەخێر)تازە بۆوە
(کەمەرە شل)یش ئاوێتە بوو لەگەڵ شیوەن و ڕۆڕۆوە.

وشەی ناو کەوانەکان، ناوی چەند گۆرانیەکی مامڵێ یە.

کوردستان-هەولێر

1.3.1999

## سروودێك بۆ هەولێر

ئەی(هەولێر)ی عەشق و جوانی
چاوگەی پــــاکی و کامـــەرانی
مەڵبەندی ســـــۆزو دڵـــداری
شـــاری ئاشـــتی و بەختـــیاری
بـــەتۆ جوانـــم، ســـەرم بەرزە
پەرســـتنت بۆ مــــن فـــــەرزە
ئـــەی شـــارەکەم، سەوزەزارت
گڵـــکەند و بـــاغی ناو شــــارت
قەڵا ســـەرکەش وەستـــاوەکەت
کۆیـــەو گەلــــی و شەقڵاوەکەت
منـــــــارەی بـــەژن زراڤـــت
بـــاڵات، ئـــاڵات، بەرزی نـــاڤت
هەمووی، جوانن، هەست بزوێنن
ســـۆزی عەشقــــێکی خاوێـــنن
بۆمن مایـــەی بەختــــەوەرین
لووتکەی بەرزی بیرەوەرین
مــــن دەزانم دووربـــم لەتـــۆ
خەوم مەرگە، (چـــرپا)ش گڵکۆ
بۆیـــە هـــــەردەم وام ئەلـــێرە
ئیلهام بەخشە ژینی ئێرە
دڵـــــم نایە لێـــت دوورکـــەوم
دەمــــــرم و بێ تۆ ناســــــرەوم
دەبمە فیــــــدای بەژنی(قەڵا)ت
دەبمــــە چەتـــــری نسێی باڵات
مـــن بە شـــیعرو بازوو و هێزم
لـــە وێـــران بـــــوون دەتپارێزم
مــــن نەعرەتەم، من گـــڕی تۆم

بـۆ خـەزانت گـوڵ و چـرۆم
مـــن داستـــانی کۆسارتم
مـــن بـولبـولی بەهارتـم
مـــن پاسـەوانی خـاکـتم
بەنــــدەیەکی بـــێ باکتـم
گـەر جاڕی مەرگــی تـۆ بدرێ
تۆ نا، با(مەخمـوری) بـمرێ...

کوردستان-هەولێر
7.7.1999

## ئاوێتەبوون

لە بەهارو لە سەیرانا
لە وەرزی گڕو سووتانا
لە ژووانی پڕ ئەڤینمان
لە قوڵایی خەوی ژینمان
من وتۆ دوو ئەڤیندارین
نەوای عەشقێکی بێدارین

بێ مانایە سەیری گوڵزار، تۆخۆت سۆزی گوڵزارمی
هاژەی تاڤگەی خۆشەویستی و نەشئە بەخشی بەهارمی
بوویە خۆرو تیشکت خستە دەریای ڕەشی بیرکردنەوە
سەری کاست خستمە ناخی بێشکەی پاکی و ژیرکردنەوە
ڕازی عەشقم لەگەڵ تۆدا بەهەشتێکە پڕ لەجوانی
دیلت کردم بە ئەفسوونی شنەی غەمی چاوەڕوانی
پێکی حەزو ئارەزوومان بۆ نۆشکردن لێواولێوە
وەرە ئاوێتەی یەکتربین ئەی نازداری پەری شێوە!.

کوردستان- هەولێر
15.8.1999

## وەسیەت

لە ناخەوە ترسی مەرگ دەریای هەستی لێڵ کردوومە
حەسرەت و ئاهی بێکەسیم مەلی شادی وێڵ کردوومە
گرێک سەرتاپای داگرتووم بە هێمنی دەمسوتێنێ
ڕەشەبای مەنفای تەنیایی چرۆی گەنجیم دەوەرێنێ
بە تاریکی هەنگاو دەنێم کۆڵێ نسکۆم بە شانەوە
بێ یار، هاودەم، کپ و مەحزوون، وام لە کۆڕی گریانەوە
بوومە قەرەج بێ ماڵ و جێ، بێ پەناگاو بێ مەفتەنم
ماڵی شیعرم پرسەدارە، وشک و بێ ڕەنگە چەمەنم
کزو بێ هێزو ڕەنگ پەڕیو، وێنەی تەرمێکی بێ گیانم
ڕۆژێ دادێ دەشمرم و بەمردنی خۆم نازانم
هەندێک دەڵێن لەوانەیە عاشق بێت و یار لێی دوور بێ
بەعزێک دەڵێن لەوانەیە کاروانی ڕێی بەرەو ژوور بێ
هەندێک دەڵێن ئای غەریب خۆی عەقڵ وهۆشی لەدەستداوە
بەعزێک دەڵێن لە ڕووی دیارە مەست و شپرزەو شێواوە
کەچی منیش کپ و بێدەنگ، بەرامبەریان بێ وەڵامم
چونکە دەزانم هەمیشە کورت دێنێ بەڵگەو کەلامم!

کوردستان-هەولێر
5.11.1999

# جاران

ئەو ڕۆژانەی کەهی یەک بوین، سەماو گوڵ و شیعر جوان بوو
بولبولی شادی دەیخوێندو بەهار هەمیشە میوان بوو
هەردوو مەستی بادەی ماچێک، دڵمان بۆیەک پەرێشان بوو
عەشق لامان گیان فیدایی، عەشق لامان تێکۆشان بوو
ڕەشبەڵەکی حەز دەگەڕا، بەزم و هەراو شایلۆغان بوو
ئەوەی بەبیرمان نەدەهات غەم و نسکۆو دابڕان بوو
گوڵباران و خەندەباران، ئامێزمان جێگای ژووان بوو
ساڵ و وەرزەکان بێ پایز، ناشتنی تەرمی خەزان بوو
ڕەخنەو گومان زیندانی بوون، سەحرای هەستمان گوڵستان بوو
تەزووی عەشق بەردەوام بوو، بێ پسانەوەو پچڕان بوو
پاسەوانی دەرگای دڵمان دەست لەسەرچاو لە فەرمان بوو
نوێنەری دڵداریمان بۆ دانوستان لە (دووان) بوو
ئای کە جاران سەردەمێکی هەمیشە پڕ لەجاران بوو
سەردەمی کۆنترۆڵی ڕق و پوچەڵکردنەوەی پیلان بوو
شۆڕشێک هاتبوە کایە، لەگەڵ باوەڕمان یەکسان بوو
شۆڕشێکی پڕ لەهەڵدێر، بەڵام یەکجار پڕ قیان بوو
ئەودەمانە عەشق ڕۆح و هەناسەدانی ژیان بوو
بە شەمعی ڕووی گوڵی یارم، تاریکستان، چراخان بوو!..

کوردستان-هەولێر
12.11.199

## گوڵزاری خۆشەویستی

یارەکەی قەشەنگ و جوان
ڕوومەت ئاڵی میهرەبان
هەستە باپڕۆین بەرەو دوور
بیکەینە بەزم و سەیران

بـەزم و هـەراو شـادیە
ڕەشبەڵـەکـە، چـــۆپیە
ئەم وڵاتە ســەرچاوەی
وەفـــاو خـــۆشەویستیە

ئەمڕۆ پەپولەی بەهـــــار
شـــادە لەمێرگ و گوڵـزار
وەرە بەیەکتر شـــاد بین
دوور بین لەغەم و ئازار

وەرە ناسکۆڵ، کچی جوان
خاوەنی وەعدو پەیمان
با کەمێک لە یـــاد بکەین
ئـــــازاری ڕابردوومان

دونیا بەگـــــوڵ ڕازاوە
دەرگـــای خـــۆشی کراوە
دڵـــداری هـــەردەم خۆشە
بە هەڵـــوێست و وەفاوە..

کوردستان- هەولێر
2.12.1999

# لووتکەی بڕوا

من هەستێکی بریندارم
من مەستێکی بە ئازارم
یاری جوانم لێ ون بوە
پەردەی دڵم کون کون بووە
ئاسۆی بەختم تەم و مژە
ڕێگام سەخت و کەندو دژە
هەنگاو دەنێم بەتـــــاسەوە
بە ئومێدو هەنـــــــاسەوە
نەنگە لە خەزان سڵ بکەم
ماڵی دڵم بێ گوڵ بکەم
دەڕۆم و ورە بەرنادەم
هەرگیز لە ترس لانادەم
هەرچەند ڕێگام پڕهەڵدێربێ
نشێو، هەوراز، یان زەنوێربێ
دەڕۆم و نــــــــاگەڕێمەوە
ئاسۆ نزیکـــــــــە لێمەوە
مرۆڤ دەبێ خــــــۆڕاگربێ
لە داڕووخان بـــــــاڵاتربێ
ژیان بە هیــــــــواوە خۆشە
ئاوازێکی پڕ لـــــــــە جۆشە
پێشینانیش گـــــوتـــــویـــانە
ژیان هەوڵ و تێکـــــۆشانە!.

کوردستان-هەولێر
2.3.2000

## پچڕان

چارەنووس بوو مرۆڤێکی سەرشێواوم لێ دەربچێ
ئاهەنگی وەرزی خۆشبینیم بە خامۆشی بەسەر بچێ
هاتمە دونیا بە سۆزی غەم، بە بێشکەی حوزن ژێرکرام
لەناو بەندی جەفاو پرسە لەگەڵ مەرگ دەستگیر کرام
کە چناری تەمەنیشم باڵای هەڵکشا بەرەو سەر
گوڵم ڕواند، بەڵام جەخار تەنیا دڕکیش نەهاتەبەر
بەهاری من، خەزانێکی بێ باران و عاسیفە بوو
بۆ هەر شۆخێ پەیامم نارد لەئاستم بێ عاتیفە بوو
لە سەرەتای شەوی عەشق چراخانیان خامۆش کردم
بە تلیاکی لێک دابڕان سەری هەستیان بێ هۆش کردم
لەگەڵ خەیاڵ لێکیان کردم کاتێ ئۆرگازم و بێ نوێژیم
ڕێگاکانیان بە دڕک چاند لە خەباتی سەرەو لێژیم
بە هیواوە هەنگاوم نا, بۆ باڵیۆزخانەی ئارامی
خستیانە نێو پەنجەکانم ڤیزەی دەڤەری ناکامی
کۆڵێ هیواو خۆزگەو حەزو نەخشەی گەورەم لەدڵ دابوو
بەڵام گشتیان خەفە بوون و هەوڵدانیش بێ مانا بوو
پڕ بەحەزم بە گوڵم گوت با مەرکانەی دڵم جێت بێ
کەچی خۆی لێم نەناس کردو گوتی سیروان نیوەی ڕێت بێ
ڕۆژگار لەجێگای ئازادیماڵی خۆی کردە زیندانم
شەرابی ماچی ڕژاندو پشکۆی خستە بان چاوانم
هەزاران جار لەکانیاوی ئاوی وەفایان خواردمەوە
تفیان کردە سەرچاوەم و، نامەی ڕقیان بۆ ناردمەوە
سکاڵام بردە لای یاران، گوتم حاڵم پەرێشانە
گوتیان یاخوا لێت زیادە بێ ئەم ئازارو دڵ ئێشانە
لە بەرامبەر بتی کچێک بە بڕواوە نوشتامەوە
کەچی سەیرم کرد کەس نەبوو کاتێ کەوا هەستامەوە
من عوریانێکی بێ ئەنوا، سەرگەردانێکی بێ پەنام
نە بەخت دەرگای کردەوەو نە بەخۆیشی گەڕا بەدوام
من گوڵزارێکی بێ جوانی و بولبولێکی بێ ئاوازم
مەنفاو غوربەت و تەنیایی پچڕاندیان تەلی سازم!.

سوریا- دیمەشق

31.5.2000

# گەشتی پەشیمانی

دووری، سووتـــان و هەژانە
شەپۆلی شێتی گـــــریانە
گوناهمان کرد گوتمان دووری
بە ئارامی هەنگـــــاو نانە

گوناهمان کرد کە ڕۆیشتین
هەموو سەوداسەری گەشتین
گەشت لەپێناو سەفای ژیان
بەڵام گشتمان بێ ڕەوشتین

ڕەوشت دەڵێ مرۆڤی پاک
دەبێ شۆڕشگێڕبێ، بۆ خاک
خۆی بەختکـــــا، تێبکۆشێ
بۆگەل بێنێ ڕۆژی ڕووناک

بەڵام ئێمە، ڕوونـــــــاکیمان
بەرامبەر خاک سوارچاکیمان
ڕاکردن بوو لە نیشتمان
ئـــا ئەوە بوو **دڵپـــاکیمان؟**

سوریا- دیمەشق
**26.11.2001**

# چــــرا

بیست وپێنج مۆم کوژایەوەو، مۆمی بیست وشەش پێکرا
کەژاوەی بووکی تەمەنم بە واوەیلا بەڕێکرا
ساڵان ڕۆیی وتەمەن کورت بوو، منیش هەر دووربووم لەدایە
ئەو دایکەی بۆمن وڵاتە و کانی هەڵوێست و وەفایە
بێ هیوایی هاوسێی بەخت و پوکانەوە هاوبینینم
بۆلای کاملا هەنگاوم نا، وێنەی سەراب بوو ڕوانینم
ژیان تەژی لەهەرەس و بە دەیانجار دەربەدەری
لەنێو مەنجەنیقی غەمدا بووە دۆستم، کوێرەوەری
هێشتا گەرمەی منداڵیم بوو قەدەر لەعنەتی لێ کردم
لەلاویشدا خەزان هات و گوڵ و پەپولەی لێ بردم
میزاجیان بەزۆر بە شوودام، نەهاتەوە باوەخونێ
نێچیری دەستی لەرزۆکم هەزار دێڵەسەگ بەربوونێ
لە فیستیڤاڵی ژیاندا نمایش نسکۆی باڵێ بوو
بەری بێستانی ڕەنجەکان، بێ تامکردنی بەهێ بوو
مۆنامۆری حەسانەوە مەستیی بە ڕۆحم نەبەخشی
سەرباری پرسەو کارەسات، بوومە تاڤگەی چارەڕەشی
لەنێو ڕەزی چاوەڕوانیم ترێی بۆگەن بوو هاتەبەر
لە کۆندۆمی ئارام بوونیش ئایدزی گومان هاتەدەر
مەلوولیم بردە مەزاد و بە داشکانیش نەفرۆشا
ڤیاگرای دونیام نۆشی، بەختی پوچەڵم نەخرۆشا
لە سەربانی لاویمەوە ڕوانیمە پەردەی ماڵان
تێک ئاڵان و ژووانم دی، منیش هاوسەری خەیاڵان
مۆبایلی دەستی زەمەن ڕازی نەبوو لە ڕێگای ئەو
لەگەڵ ئاسۆ تەعاروف کەین، بەڵکو هەرنا زیز بێ شەو
گوڵم ڕواند بۆ ئەڤین و بەهارم بردە پێشوازی
کەچی گوتی دەمت داخە، کێ دەڵێ تۆ عەشق خوازی؟
دەربەدەری و کۆچی یاران خەندەیان کوشت بە لێومەوە

هومای زیزبوون خۆی کوتایە دڵی یەکجار پەشێومەوە
گوتم مەڕۆ، بێناز دەبم، جێم مەهێڵە چرای چاوان
ئیتر دڵم بەکێ خۆش بێ، لەگەڵ چیدا بکەم دووان؟
کەچی ڕۆیی و دوورکەوتەوە، لە دەنگ و هەواڵ پچڕانی
یەکجار تەفروتونای کردم، ناخۆشی کرد یادەکانی
حەزم وابوو لەگەڵ چرا، هەموو شوێنێک چراخان کەین
سەحەرێک پێکڕا بڕۆین و تف لە (داب)ی دیوەخان کەین
لامان وابوو نەخشەدانان باشترە لە پاڕانەوە
نەک بەرامبەر وەهمی ئاسمان کۆیلە بوون و نوشتانەوە
بەڵام ئەنجام، وشەی سەفەر بووە دیاری بۆیەک بوونمان
گوفەکی کۆچ بۆگەنی کرد(ماکدۆناڵد)ی لەیەک چوونمان
دڵێکم بوو پڕلەهیوا، عەتف و پاکیی لێ دەباری
بەڵام هەر زوو وێرانی کرد کولێرای ڕەشی هەژاری
گوتم قەیناکە کۆڵنادەم، هەنگاو دەنێم بۆ گەیشتن
کەچی دروشمێکی هیچ بوو(کۆشش لەپێناو سەرکەوتن)
گوتم ئۆخەی زستان ڕۆیی و بەهارم لێ بوژایەوە
زۆری نەبرد زستان هات و ڕێبەندانی هێنایەوە
گوتم ڕۆژێ حەزی زیزبووم لەگەڵم ئاشت دەبێتەوە
چاوەڕوانیم کۆتایی دێ، نازدار حەیرانیش دێتەوە
زۆر شتم گوت، زۆریش هێشتا لە پەیڤین و گوتن دابوون
ئەوسا حەزو خۆزگەکانم خۆشڕەنگ دەژیان و هەرمابوون
بە بارانی کامەرانیم کێڵگەی دەروونم ئاو دەدا
لە قەندیلی چیای هێزم ئەسپی مەحاڵم تاو دەدا
مەگیرانیم بە پیلان کرد، پیلان دژی بەرماڵەکان
(بەیان)ی فەوتانم دەرکرد بۆ چەقۆکێشە زاڵەکان
کەچی ویژدان تۆپیوەکان بە خۆفرۆش ناویان بردم
تەڵەی مەرگیان بۆم نایەوەو هەزار بوختانیان پێ کردم
ڕاستە کپم، داخی گران، دەنگی شیعرم نایانگاتێ
بەڵام دڵنـــــــیام بەرائەت نامەی ڕەفزیان دەداتێ
ئاڤێستا وای تێگەیاندم، تاوسێ مەلەک گوتی وایە
زۆرجار کڕبوون شۆڕشێکە، ئەنجامی باشی لە دوایە

گوتمە ژیـــــــان با پێکەوە ببینە گیـــــــانی بەگیانی
با خزمەتچی سەوزبوون بین لە نەهاتی و بێ بارانی
لەگەڵ ژیان بووینە هەڤاڵ، سەرقاڵ بووین بە(وانە)ی مەشق
بارەگایـــــــەکمان کـــــــردەوەو ناومان لێنا،ماڵی عەشق
لە کەناڵی عاشـــــــقان و لەســـەر دێڕی ڕۆژنامەکان
بە شان وباڵیان هەڵگوتین، عاشـــق و خاوەن خامەکان
فتوا لەئاست کچێنیمان خەجـــــاڵەت و نێرەمووک بوو
چەمکی شەڕو پاکتاوکردن لامان بێ نرخ و بچووک بوو
ئێمە قەشـــــەی تۆبەکار و خاوەن هێزو جوگرافیا بووین
بۆ هەڵزنان بەرەو لووتکە، شۆڕشڤان و گەریللا بووین
بەڵام ئەسەف سیناریۆکان کۆتاییان لێ تاڵکردین
فاڵگرەوەی بە ئەزموونیش نوشتەی ملی بەتاڵ کردین
ئەی فاڵگرەوەی بێ ویژدان، هەی ناکەس بەچەی بێ ڕەوشت
تاهەتایە بە نەفرەت بیت، هەی دیکتاتۆری خۆپەرست
تۆ چیت بەسەرمان نەهێنا، پرسەو مەرگ و لێک دابڕان؟
هەمووی تۆپێت ئاشنا کردین، پیشەی بێ مەیلی وداڕووخان
بە جەسووریەوە دەبێژم سەرباری هەموو ئەمانە
ئەوەی دیم و هاتنە پێشم بۆمن بوونە پەند و وانە
چامەی هەرەسم خوێندەوەو فێربووم ژیان مانای چیە
زانیم ئەگەر هەنگاو نەنێم، جێ دەمێنم، چارەم نیە
بۆیە ئێستا ڕێبوارێکم وێڵم بەدوای گوڵ و جوانی
هەنگاو دەنـــــێم و کۆڵـــنادەم تـــا دەگەمە کامەرانی
گرنگ نیە بدۆڕێــــــنم بەهای لاوی و چـــــرۆی تەمەن
بەڵام گرنگ بسەلمێنم ئەمن سەرکەوتووم یان زەمەن!..

19.11.2001/ دیمەشق
27.4.2002/ بەیرووت
26.7.2002/ تاران

# پایزی فیراق

چۆنت توانـــــــی لە بەهاری سەفای عەشقت بمتۆرێنی
بێ ڕەحـــمانە هەنگاو بنێی، چرۆی یادم بوەرێنی
خۆ بڕیـــــاربوو لەئاسمانی بۆ یەکتربوون، لەباڵ بدەین
هەلقەی جوانی دەستگیرانیی بە تاسەوە لەدەست بکەین
بۆکوێ دەڕۆی، یادەکانم لەگەڵ خۆتدا لێ ون دەکەی؟
نەک تەنیا خۆت، دڵی منیش بۆ پایزی ونبوون دەبەی
بڕیاربدە بگەڕێوە، بـــــــا پێکەوە بە دڵ مەستی
گوڵ بچێنین لە دەربەندی شاری خەون و خۆشەویستی
نـــاکرێ لەدوای ساڵانێـــکی ژانـــــــی قووڵی چاوەڕوانـــــــی
بـــــــە پێوانەی بەدکارانمان، بە دوودڵـــــــی تێـــم بڕوانی
گەر بێنیـــــــــەوە بەرچاوانت، تەمـــــــەنی شادی پڕ ژووان
هەرگـــــــیز باوەش ناکەیتەوە بۆ دۆزەخی لێک دابڕان
ئەو ڕۆژانەی لە دەیجووری قەیرانی سەختی دڵداری
ئێمە یەکترمان دەپەرست، لە پەرستگای ئەڤینداری
ئەو ڕۆژانە خەیاڵێک بوون، خەیاڵێکی سەرکێشانە
هاتیە خەڵوەتگای باوەشم بە زیکرێکی دەروێشانە!.

کوردستان-هەولێر
28.4.2003

## هەڵوەرین

ڕۆژگارێکە لێم دووری، دووری تۆش مەرگ و ژانە
وێڵی دوای دیداری تـــۆم لەم سەحرای دابڕانە
چۆنت توانی لێم زیزبی، فریشتەی گوڵی تەمەن
تا دێیەوە دەمکوژێ دەستی ڕەشی ئەهریمەن
برووسکەی هەوری یادت بادەی عەشقی تاڵ کردووم
دووریت رۆحی وەراندم، سەیرە تا ئێستا زیندووم
لای من یەکجار پڕ ژانە، نەغمەی وەرزی تەنیایی
کەچـــی بوویە ڕێبواری ڕێگای سەختی جودایی
یاخی مەبە لەعەشقم، کێ پێی گوتی بتۆرێ؟
ئەوەتا جەستەم خوێنی دووری تۆی لێ دەچۆڕێ
هانێ ئەوە دڵ وگیان ، دەیکەمە قوربانی تۆ
نیـــــگام کەلەپچە دەکەم، لـــــە بەندی چاوانی تۆ
مـــەهێڵە بـــــارانی کۆچ لە ناخـــــــمدا بباری
رۆحـــم وەکو فرمێسک لــــەچاوم بێتە خــــــواری
تـۆ خونـچەی گوڵبـەدەم و چیـمەنی بـەهارانی
هیـواو ئاواتـی ئەمڕۆو خۆشەویســتی جـــارانی!.

کوردستان-هەولێر
26.5.2003

# خەرمانی عەشق

هاژەی عەشقت پیرۆزە
ئـــاوازێکی بەســــــۆزە
هەمیشە گـــڕو گــڵپەی
وەک ئاگـــــری نەورۆزە

دڵم بۆتە ساباتی نیگای کچێکی پەری
دەگەڕێ، بەدوای وێڵە لە کوچەی سەوداسەری
دەزانم ڕێگام دوورە، بەڵام هاوکات دڵنیام
عەشق چیای ئازارە، دەروازەی بەختەوەری

چەند خۆشە ماڵی دڵمان پڕبێت لە چرای ئەڤین
لە چاوماندا بدرەوشێ ئاسۆی گەشی پێکەنین
وشەی عەشق بکەینە قیبلەگای ئارەزوومان
هەموو سەحەرێک بچین گوڕو تینی بۆ بەرین

وەرن گوڵی بۆیەکبوون لە وڵاتمان بچێنین
لــە باغـــی وەفاداری چـــرا دابگیرسێنین
بە نیگای پڕ لەهەستی ژووانی ئەڤینداران
زیندانی ڕق و کینە، لە ناخمان بڕوخێنین!..

ئوستراليا- سيدنى
1.6.2004

# کەلاوە

چەند ناسک بوون چرپەی دەنگی، ماچی تەڕی جێی ژووانمان
چەند شیرین بوون خەندەی گەشی هەمیشەیی سەر لێوانمان
بۆکوێ ڕۆیین، ڕۆژانی پڕ گوڵ و بەهارو سۆزداری
کە لەدڵمان گڵپەی دەهات گڕی نەورۆزی دڵداری
بۆچی ئێستا شنەی عەشقت بەبێ مەیلی داپۆشیوە؟
دەڵــێی هەنــگی وەفاداریت هـــــەر بێدەنگیی هەڵمژیوە
تــۆ دڵــت وەک بەفــر ســپی و بـاوەڕت وێنــەی چیـا بوو
هەمیشە دەریای ناخیشت(دوڕ)ی عەشقی منی تیابوو
ئەی بۆچی ئێستا بێدەنگی، لە ئاست کەسێک ساڵەهای ساڵ
تۆی لە رۆحی خۆیدا هەڵگرت، لە پێناوت بووە زوخاڵ
خۆ من کـچێ تا ئێستـاکەش هـەر پابـەندی ئەو ئەڤینەم
چـاوەڕێی تـۆزێک بـەزەیی ئـەو دڵـە بێـگەردو ڤیـنەم
تۆ مرۆڤێکی هەست بەرزو, خاوەن فەرهەنگ و کەلتووری
لە بێ مروەتی و دڵڕەقی و نامیهرەبانی، بەدووری
چـۆن دڵــت دێ ئازیزی خـۆت لەنــاو غەمــدا بتوێنــیەوە
بـۆ ئــەو کــارە نــاڕەوایەت پاســاوێکیش نەهێنـــیەوە
دە وەرەوە، کـوانێ تەمــەن هێنــدە زۆری بەبــەرماوە
واخــەریکــە دەڕوخـــێم و نــاخــم دەبێــتە کــەلاوە!.

ئوستراليا- سيدنی
20.10.2004

